# مێژوو ٧

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە،
کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی
کوردستان دەریدەکات



* یەکێتیی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨٧١
* ئەحمەد نەعیم بابان زادە
* دۆزینەوەی شوێنەوارێکی زۆر لە سماقوڵی
* صلاح الدين الايوبي مثالا للفروسية
* طبقة التجار في العراق في عهد المماليك

ژمارە ١٥
ساڵی چوارەم
بەهاری ٢٠١٠






**هەموو ئەو بابەتانەی لە گۆڤاری مێژوو بڵاودەبنەوە نوسەرەكانیان لێیان بەرپرسیارن تەنیا سەروتار نەبێت كە گۆڤاری مێژوو لێی بەرپرسیارە**

- گۆڤار : مێژوو
- ژمارە : [ ١٥ ]
- تیراژ : [ ٥٠٠ ] دانە
- چاپخانە : گۆڤار

**كوردستان / هەولێر - كۆڵانی بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هولێر**
g.mezhu@yahoo.com
g.mezhu@hotmail.com

# پێرست

سەروتار

(١٤ی تەموزی ١٩٥٨) كودەتا یان شۆڕش

## تویژینەوە



## وەرگێڕان



## القسم العربي

## ◄ کەشکۆڵی گۆڤار

# ( ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ ) كودەتا یان شۆڕش

سەرنووسەر

نیو سەدە پتر بەسەر (١٤ی تەموزی ١٩٥٨) لە عێراق تێپەڕیووە تاكو ئێستا ڕای جیاواز هەیە لەسەر ئەوەی كە ئایا كودەتا یان شۆڕش بووە؟

ئەوانەی بە شۆڕشی دادەنێن ئەڵێن ئەگەر شۆڕش بریتی بێت لەو گۆڕانە بنەڕەتییەی لایەنەكانی سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی دەگرێتەوە، ئەوا (١٤ی تەموز) لە عێراقدا لە بواری سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی گۆڕانكاری بنەڕەتی دروست كردووە، ڕژێمی سیاسی لە پاشایەتی بۆ كۆماری گۆڕی و لەبەرژەوەندی دەرەبەگ و خاوەن موڵكەكانی عێراقی دا و پتر گرنگی بە هەژاران دا.

ئەوانەی بە كودەتاشی دادەنێن دەڵێن (١٤ی تەموز) بریتی بوو لە بزوتنەوەیەك كە سوپا لە عێراق پێی هەستا نەك جەماوەر ئەگەر دواتریش جەماوەر پشتگیری خۆی بۆ دەرخست ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی بە شۆڕشی بزانین چونكە جەماوەر لە عێراق و زۆر ناوچەی ڕۆژهەڵات لەسەر ئەوە ڕاهێنراون كە پشتگیری لەو هێزانە بكەن كە دەسەڵاتیان بەدەستە. هەروەها دەڵێن یاسای چاكسازی كشتوكاڵی كە دەسەڵاتی نوێ بە دەستكەوتی دەزانی لەئەنجامدا بووە هۆی ئەوەی كشتوكاڵ لە عێراقدا بەرەو دواوە بگەڕێتەوە، وەكو ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین تەنانەت سەوزە و میوەش لە دەرەوەی عێراق بۆ ناو عێراق دێت. لەبواری خوێندنیش دەڵێن ئەگەرچی ژمارەی خوێندەواران

لەعێراق لەسەردەمی کۆماری بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی پاشایەتی پتر بووە بەڵام لە ڕووی چۆنیەتیەوە خوێندن و خوێندەواران بەرەو خراپی چوون، واتە چەندایەتی لەسەر حسێبی چۆنایەتی بوو، لەڕاستیشدا کەس ناتوانێ نکوڵی لە دابەزینی ئاستی خوێندەواری بکات، چ لە کوردستان و چ لە عێراق دا. لەڕووی سیاسییەوە عێراق پەیوەندی لەگەڵ کوەیت و ئێران و تورکیا و بەریتانیا و میسر و ئوردن بەرەو خراپی بوو.

هەرچەندە بەشێوەیەکی فەرمی مۆڵەتی کارکردن بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان دەرچوو، بەڵام شۆڕشی ئەیلول دژی دەسەڵاتی ١٤ی تەموز لەعێراق بەرپابوو، هەروەها گەورەترین ڕەخنە لە سەرکردایەتی نوێی عێراق دەگیرێت ئەوە کە لە (١٤ی تەموزی ١٩٥٨)ەوە کەسایەتییە سەربازییەکان فەرمانڕەوایی عێراقیان کرد و وڵاتیان بەرو گرژی سیاسی و شەڕ لە ناوخۆ و دەرەوە برد.

دەربارەی (عبدالکریم قاسم)یش دەووترێت کە ئەویش ئەوەندەی کەسایەتییەکی سەربازی بوو، و بۆ سوپا دەستی دەدا، کەسایەتییەکی سیاسی سەرکەوتوو نەبوو و بۆ سەرکردایەتی کردنی وڵات دەستی نەدەدا.

# فەلسەفەی مێژوو لای ڤیکۆ

پ.ی.د. ئاکۆ برهان محمد
سەرۆکی بەشی مێژوو/ زانکۆی کۆیە

- کورتەیەك لە ژیاننامەی ڤیکو :

جیۆڤانی باتیستا ڤیکو لە ساڵی (١٦٦٨) لە شاری (ناپۆلی) لە وڵاتی ئیتالیا لە دایك بووە لە بنەماڵەیەکی هەژار و ڕۆشنبیرەوە، باوکی خاوەنی کتێبخانەیەك بووە لە شارەکەدا، و هەوڵی زۆری داوە بۆئەوەی کوڕەکەی خۆی فێری ڕۆشنبیری بکات، لەبەرئەوە ڕێ و شوێنی گونجاوی بۆ دەستنیشان کردووە تاوەکو هاودەمی باری چاخ و کۆمەڵگاکەی خۆی بێت، کە لەو سەردەمەدا بزوتنەوی چاکسازی و ڕێنسانس گەشەی سەند تەنانەت گەیشتە دەرەوەی ئیتالیاو وڵاتانی ئەوروپای گرتەوە و ململانێی ئاینی نێوان هەردوو ڕەو تی کاتۆلیکی و پرۆتستانتی لە ئەوپەڕیدابوو کە ناسرابوو بە جەنگە ئاینییەکان، جگە لە چەندین جەنگ و گۆڕانکاری نوێ لە ئەوروپادا.

لە ڕاستیدا ڤیکۆ هەر لە سەرەتای ژیانە ڕۆشنبیرییەکەیەوە سوودێکی زۆری لە کتێبخانەکەی باوکی وەرگرتووە، جگە لە خوێندنی ئەکادیمی لە کۆلێژی یەسوعی لە شاری ناپۆلی و تیایدا زانستەکانی یاسای ڕۆمانی و ئەدەب و ڕەوانبێژی ومەنتیق و فەلسەفە و زمانە کۆنەکان و زانستی لاهوتی و یاسا و مافی

خوێندووە، جگە لە لێکۆڵینەوەی قوڵی لەسەر چەندین کتێبی کۆن لەنێو دێرەکاندا.

لە شاری (ڤلتولا) بووە بە مامۆستای تایبەتی و بۆ یەکێک لە کوڕانی خانەدان و قەشەکانی ئەم شارە، بابەتەکانی یاسا و عاقی دەووتەوە بۆماوەی نۆ ساڵان بەردوام بوو لە خزمەتی ئەم شارەدا کە هەر لەوێدا بە قووڵی توانی بچێتە بنج و بنەوانی کتێبە کۆنەکان و بەدواداچوونێکی زۆری بۆ کرد وپاشان گەڕایەوە شاری (ناپۆلی)، لە زانکۆی ناپۆلی بووە مامۆستای هونەری ڕەوانبێژی و ووتاربێژی لەنێوان ساڵانی (١٦٩٢- ١٧٤١) جگە لە گووتنەوەی بابەتەکانی مێژوو فەلسەفە و ئەدەب، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو شارەزاییەی گوتنەوەی بابەتی یاسا بوو لەم زانکۆیەدا.

بەم جۆرە دەبینین ڤیکۆ بە تەنها گرنگی بە مێژوو نەدلوە، کەچی وەك مێژوونووسێکی بلیمەت و زیرەك بەدیارکەوت بەڵکو هەتدێ لە مێژوونووسانی جیهانی ڤیکۆ بەیەکێك لە دامەزرێنەرانی زانستی مێژوو دەزانن، بەڵام هەتدێکی دیکەیان لایان وایە یەکەم کەسێك بووە کە بنەماکانی فەلسەفەی مێژووی دارشتووە لە چاخی نوێدا، ئەو هەوڵیدا لە ناو زانکۆدا بنەماکانی ڕێبازی لێکۆڵینەوی مێژوویی دابڕێژێت وەکو ئەوەی (فرانسیس بایکۆن) کردوویەتی لە دانانی ڕێبازی توێژنەوەی زانستی، یاخود (ئۆگەست کۆنت) لە زانستی کۆمەڵناسی، بەڵام هەوڵەکانی تووشی بەربەستی بیروڕاکانی (دیکارت) بوو کە لە زانکۆی ناپۆلی فەلسەفەی دیکارتی یاخود (ڕێبازی کارتیزی) تەشەنەی کردبوو کاتێ جەختی لە ڕێبازی بیرکارییانە دەکردەوە کە تاکە ڕێبازێکی یارمەتیدەرە بۆ گەیشتن بە ماریفە و زانستی ڕاست، بەڵام ڤیکۆ لەلای خۆیەوە ئەمە ڕەتدەکاتەوە، بەو جۆرەی هەر زانستێك ڕێبازێکی تایبەتی خۆی هەیە و ئەوەی لە زانستی

سروشتی دەشێت مەرج نیە ڕێبازەکەی لە زانستی کۆمەڵناسی بشێت و تادوایی، لەبەرئەوەی چوارچێوەی بیروڕا وئایدیاکانی ڤیکۆ لە نووسینەکانیدا بۆ خزمەتی ئەم ڕێبازە تایبەتییەی خۆی بووە.

ڤیکۆ یەکەم کتێبی کە داناوە بەناوی (دانایی ئیتالی کۆن) کە تیایدا بیروڕاکانی(دیکارت) ڕەتدەکاتەوە و جەخت لە تیۆریاکانی میتافیزیکا و ماریفە دەکاتەوە لە ساڵی (١٧١٦) کتێبێك دادەنێ لەسەر میرێك لە ئیتالیا و زۆریش ستایش و هەڵبەستەی تێکردووە، لە ساڵی (١٧٢٠) بەرگی یەکەمی کتێبی (یاسای جیهانی) بلاو کردووە پاشان ساڵی (١٧٢١) بەرگی دووەم و ساڵی (١٧٢٢) بەرگی سێیەم بلاودەکاتەوە، بەلام لە دیارترین کتێبەکانی بەناوی (زانستی نوێ) لە ساڵی (١٧٢٥) بلاوکرایەوە و لە پێنج بەرگ پێکهاتبوو، بەرگی یەکەم لەسەر بنەما و ئایدیاکانە و بەرگی دووەم لەسەر دانایی شعرە و سێیەم لەسەر دیارخستنی ڕاستییەکانی هۆمیرۆسە و چوارەم لەسەر ئاراستەی مێژووی نەتەوەکانە و بەرگی پێنجەم و کۆتایی لەسەر گەڕانەوەی کودەتاکانە. لە ساڵی (١٧٣٠) لە ئەکدیمیای (ئاسۆردێتی) خزمەتی کردووە، لە ساڵی (١٧٣٥) لە ئەکادیمیای (ئۆزیۆسی) خزمەتی کردو لە هەمان ساڵیشدا بووە مێژوونووسی شاهانەی پاشا (شارل بۆربۆن)، لە ساڵی ١٧٤١ باری تەندروستی زۆر نالەبار بوو، تەنانەت کاریگەری لەسەر هۆشمەندێتی و زیرەکی هەبوو، خۆی خەریك کرد بە نووسینەوەی زیاننامەی خۆی، جگە لە دەستکاریکردنی کتێبەکەی (زانستی نوێ). لە ساڵی (١٧٤٣) کتێبەکەی سەر ژیانی خۆی تەواو کرد تیایدا دانی بەوەدا نا کە سوودێکی زۆری لە بیروڕاکانی هەریەك لە (ئەفلاتۆن)ی فەیلەسووفی یۆنانی و (تکیتۆس)ی فەیلەسووف و ساسەتمەداری ڕۆمانی، وەرگرتووە. لە ساڵی (١٧٤٤) هەروەك چۆن بە هەژاری چاوی بە دنیا هەڵهێنا بوو بەمجۆرەش بە هەژاری ماڵئاوایی لە دنیا کرد.

- تیۆریاکانی لەسەر مێژوو و مێژوونووسان :

تیۆریاکانی ڤیکۆ سەبارەت بە توێژنەوەی مێژوو رۆڵی خۆی هەبوو وەکو بنەمایەکی رێبازی پێویست بۆ سەرهەڵدانی زانستی مێژوو، لەبەر ئەوە تیۆریاکانی ئەو زیتر لە رێباز دەچێت وەك لە رەوتێك بچێت، واتە گرنگییەکەی بۆ خزمەتی زانستی مێژوو دەگەرێتەوە بۆ ئەم رێبازەی کە خستوویەتییە روو بۆ توێژینەوەی زانستی مێژوو زیاتر لەوەی کە بگەرێتەوە بۆ رەوتێك لە فەلسەفەی مێژوو، لەبەرئەوەی دەستپێکی رێگەیەك بوو بۆسەر تیۆریا گشتییەکان ئەمەش وای کرد بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی زانستی مێژوو بژمێردرێت.

ڤیکۆ سوودی زۆری لە هەوڵەکانی مێژوونووسانی ئەوروپی سەدەی حەڤدەهەم وەرگرتووە، بەرادەیەك پێشکەوتنی لەرووی رەخنە و شیکاری بەخۆوە بینییوە، لەم روانگەیەوە هەوڵیداوە بۆ پێشخستنیان و بەرفراوانکردنیان کە بتوانێت سنووری بەسەرهاتە مێژووییەکان ببەزێنێت بۆ شیکاری و ووردبوونەو تیایدا بەرێگەی رامانی قوول و گشتگیرانە، بەڵکو ببێت بە رێبازێکی لێکۆڵینەوەی مێژوویی کە خۆی بەناوی (رێبازی پێشکەوتن) ناوی ناوە، تیایدا پشت بە دیمانەکان و توانا پێشهاتییەکان ئەندێشەکانی مێژوونووس دەبەستێت، لەسەر وێناکردنی شێوازەکانی هۆشمەندێتی، وادیارە ئەم تیۆرییانەی ڤیکۆ کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر پرۆسەکانی چۆنیەتی بینینی بنەماکانی توێژینەوە مێژووییەکان تاوەکو سەرەتای سەدەی بیستەم، بەڵکو کاریگەری هەبوو لەسەر بیروراکانی فەیلەسووف (یۆهان هێردەر ١٧٤٤- ١٨٠٣) بەتایبەتی لە سروشتی زانیلی مێژوویی، بەوپێیەی زانینێك و ماریفەیەکە تایبەتە بە مرۆڤی مێژوونووس و دروستکاری رووداوی مێژوو.

هەوڵدانی ڤیکۆ بۆ دانانی بنەما تایبەتییەکانی لێکۆڵینەوە مێژووییەکان دەستپێکەکەی بەهۆی ئەمانەوە بوو:

١- جێگیرکردنی ئەوەی کە مێژوو دەتوانرێت پتەو بکرێت بە بنەما فەلسەفییەکان.

٢- گواستنەوە بۆ بیرۆکەیەك کە زانینی مێژوو گریمانەی بەرفراون و توانای بەزاندنی بەربەستەکانی لێکۆڵینەوەی مێژوویی هەیە، کێشەکانی مێژوو لە سەختی و دژواری، مێژوونووس توانای چارەسەری هەیە بەهۆی پێکەوەنانی بیروڕایەکی دیار لەسەر زانستی لێکۆڵینەوەی مێژوو و دانانی بنەما تایبەتییەکان تایبەت بەو.

لەم ڕۆشناییەدا ڤیکۆ چەند بنەمایەکی تایبەتی لێکۆڵینەوەی مێژوویی پشت بەست بە سروشتی ڕووداوە مێژووییەکان داناوە، ئەم لێکۆڵینەوانە بە تەنها نەبووە دانانی بنەماکانی کاری مێژوویی و بەس بۆ ڤیکۆ، بەڵکو هانی ڤیکۆی دا بە دانانی تیۆریای بەدواهاتنی سەردەمەکان لەچوارچێوەی تێڕوانینی فەلسەفیانە، بەم جۆرەش ڤیکۆ توانی ببێت بە ڕێبەری ڕۆژئاواییەکان بۆ پێگەیاندنی مێژووی بابەتییانەی وزانستیانە لە سەردەمی نوێدا.

ڤیکۆ باس لەوە دەکات کە بۆ ئەوەی مێژوونووس دوور بێت لە هەڵەوە پێویستە خۆی بەدوور بگرێت لە چەند وەهمێك (Idols) ئەم وەهمانەش بریتین لە:

١- وەهمی زێدەڕۆیی مێژوونووسانی ئەکادیمی: لەبەرئەوەی مێژوونووس خۆی ڕۆشنبیرە و زانایە وادەزانێت کەسایەتییەکانی دروستکەری ڕووداوی مێژوویین ئەوانیش لە پلەیەکی بەرزی ڕۆشنبیری و زانستدا بوون، بەڵام ڤیکۆ

ئەمە بە وەهم دادەنێ و ڕەتی کاتەوە و دەڵێت لەوانەیە بە پێچەوانەشەوە بێت ئەوانەی ڕۆڵیان لە مێژوودا بینییوە لە هەرە نەزانترین و نا ڕۆشنبیرترین کەس بن، ئەمەش هاوشێوەی مرۆڤی ئەشکەوتە لای ( فرانسیس بایکۆن).

٢- وەهمی زلکردن و بەرزڕاگرتن: ڤیکۆ دەڵێت بەشێك لە مێژوونووسان ئەو سەردەمە یاخود ئەو چاخانەی لێی دەکۆڵنەوە لە باسەکانیاند زیادەڕەوی بۆ دەکەن و زیاد لە سنووری خۆی زلی دەکەن و بەرزی ڕادەگرن و زیادەڕەوی دەکەن بەوپێیەی لە سەردەمێکی تری جیادەکەنەوە کە دەوڵەمەندترە لە سەرجەم بوارەکان بۆ لێکۆڵینەوە، ڤیکۆ ئەمە ڕەت دەکاتەوە و پێی وایە هەر سەردەم و قۆناغێك بە دەستکەوتەکانی پێگەکەی خۆیەتی لەنێو ڕووداوە مێژووییەکاندا و بەگوێرەی ئەو ڕۆڵەیە کە بەگشتی لە مێژوودا گێڕاوییەتی.

٣- وەهمی لەخۆبایی نەتەوەکان: بەپێی بیروڕای ڤیکۆ هەر نەتەوەیەك هەوڵدەدات مێژووەکەی خۆی بەشێوازێکی نا بابەتییانە بنوسێتەوە و بە تەنها لایەنە ڕەوشنەکانی تیادا دەربخات و هەرچی لایەنی تاریك و لاواز و تاڵە بیشارێتەوە و دیاری نەخات.

٤- وەهمی ڕەسەنایەتی: واتە باوەڕهێنانی مێژوونووس کە ئەگەر دوو نەتەوە لە ڕواڵەتێك یان سیستەمێك لە یەك دەچوون ئەوا حەتمییە یەکێکیان لەوی تریان وەرگرتووە واتە ناڕەسەنەکە لە ڕەسەنەکەی وەرگرتووە، یاخود کاریگەرییان لەسەر یەکی تر هەبووە، ڤیکۆ دەڵێت ئەمە مەرج نییە چونکە نابێت توانای داهێنانی هزری مرۆڤایەتی لەبیر بکرێت، چونکە مرۆڤ توانا و ژیری خۆی هەیە لە پێکەوەنان و داهێناندا بەبێ یارمەتی دەرەکی و لاسایی کردنەوەی.

ء- وەهمی نزیکی لە ڕووداو:کە تیایدا مێژوونووس پێی وایە ئەوانەی پێشی خۆی لە مێژوونووسان زیاتر شارەزاتر و ئاگادارترن لە ڕووداوە مێژووییەکان چونکە نزیکترن لە سەردەمی ڕووداوەکان، بەوهۆیەوە بیرهاتنەوەی مێژوو ڕوونتر و دیارترە هەرچەندە مێژوونووس نزیك بێت لێی، بەڵام ڤیکۆ ئەم ڕایەی پێ پەسەند نیە و بە هەڵەیەکی گەورەی دادەنێت چونکە مێژوونووس نابێت بە تەنها پشت بە چیرۆك بێژی مێژوو ببەستێت بەڵکو لە زۆر کاتدا پشت بە شێوازەکانی توێژینەوەی زانستی دەبەستێت بۆ دیارخستنی ڕاستی ڕووداوە مێژووییەکان، لەوانە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی بۆنموونە لەسەر لایەنەکانی زمانەوانی و یاساکان و داب و نەریتەکان و خورافات و ئەفسانەکان و هی تر.

ڤیکۆ ڕەخنەی لە فەیلەسووفانی سەدەی حەڤدەهەم گرتووە وەکو (گرۆتیس) و (هۆبز) ڕەخنەکەشی لەبەرئەوەی:

١- ڕابردوویان شی کردۆتەوە بۆ بەرژەوەندی و ئامانجی خۆیان و وەکو خۆی ڕاڤەیان نەکردووە لە توێژینەوەکانیان، بەڵکو لە خزمەتی تیۆریای سیاسی پەیوەستدار بووە بە سەردەمی خۆیان.

٢- پێویستبوونیان بە هەستی مێژوویی چونکە جیاوازییەکی ئەوتۆیان بەدی نەدەکرد لە سروشتی مرۆڤایەتی سەردەمێك بۆ سەردەمێکی تر و لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر، بەمەش دیمەنێکی سەرپراوەی ناڕاستیان بەسەر مێژوودا سەپاند، بەتایبەتی لەسەر هەست و هزری مرۆڤی سەرەتایی جۆرە سەپاندنێك هەبوو لەسەریان بەتایبەتی لەسەر هزرە فەلسەفییەکانیان کە ڕاستییەکەی زۆر لەدوای ئەوان گەڵاڵەبوو، پاشان توێژینەوەکانیان لەسەرهەڵدانی کۆمەڵگە و سەرهەڵدان دەوڵەت توێژینەوەی زاڵمانە و

سەپێنراو بوون نەك دەرەنجامی توێژنەوەی مێژووییانە، كە لێرەدا پێویستە ڕێبازی پێكهاتەی مێژوویی هەبێت بۆ بەدواداچوونی چۆنیەتی پەرەسەندنی كۆمەڵگاكان، كاتێك ڕێباز جێبەجێ بكرێت وسەنگی توێژەر بۆلای هزرە فەلسەفیەكان بە تەنهایی نەدات و زیاتر ڕێگە بەڕێبازی توێژینەوەی زانستی بدرێت ئەوا توێژەر دەگاتە تیۆریای نوێ و شیاو.

بەڵام ڤیكۆ لەم ڕەخنانەی لە فەلسەفەی سیاسیدا مانای ئەوە نەبووە كە تێڕوانینە فەلسەفییەكان بەشێوەیەكی گشتی لەخۆی دوور بخاتەوە، بەڵكو سوودی دیاری لە فەلسەفە بینیوە و لای وایە ڕواڵەتە جیاوازەكانی ژیانی كۆمەڵایەتی لە قۆناغێك لە قۆناغە مێژووییەكان تێهەڵكێش و تێكەڵاون پێویستە لێرەدا توێژینەوە بە ڕامانی فەلسەفیانە هەبێت، و ئەوە لەبیرنەكرێت كە هونەر و ئاین كاردانەوەی هەیە لە ڕێكخستنە ئابووری و سیاسییەكان، هەروەها یاسا و ڕەوشت و شێوازی بیركردنەوە.

ڤیكۆ باس لەوە دەكات كە چەند ڕێچكە و بنەمایەك هەیە پێویستە لەسەر لێكۆڵەری مێژوو بەداواچوونیان بۆ بكات و جێبەجێیان بكات لەوانە:

یەكەم/ مێژوونووس دەتوانێت بچێتە ڕۆشنایی ڕووداوە مێژووییەكان و پەرەسەندنەكانی ئەگەر بتوانێت خوێندنەوەی زمانەوانی بۆ بكات، چونكە زمان هۆی ڕا دەربرین و گەیشتی بیرۆكەیە لەنێو خەڵكدا، جگە لەمەیش هەر سەردەمە و ڕێبازی زمانەوانی و ڕەوانبێژی خۆی هەیە كە جیای دەكاتەوە لە سەردەمێكی تر و تەنانەت مانای هەندێ لە وشە و زاراوەكانیش بەپێچەوانەوە دەگۆڕێت بەگوێرەی سەردەمەكە.

دووەم/ خوێندنـەوەی ئەفـسانەکان و خورافاتـەکان سـوودی خۆیـان لـەم بـوارەدا هەیە، چونکە ئەفسانە و خورافە ئاوێنەیەکی بۆ شێوازی بیرکردنـەوەی سـەرەتایی مرۆڤایەتی و گەلانی کۆن، ئەم گەلانە هێشتا نەگەیشتبوونە قۆناغی بیرکردنـەوەی بابەتییانـە بۆئـەوەی ڕاکانیـان دەربـڕن لەشـێوەی یاسـاکان و ڕێکخـستنەکان و پێڕەوەکاندا، لەبەرئەوە ئەفسانەکان جۆرێك لە دەربڕینی لایەنـەکانی کۆمەڵایـەتی و ئابووری و سیاسی و ئاینی بوون.

ڤیکۆ جـەخت لـە مێـژوونووس دەکاتـەوە کـە نابێـت بـە هـزری ئێـستا ڕاڤـەی ئەفسانە کرنەکان بکات، بەڵکو لە سەری پێویستە لە مەبەستەکانی ئەم ئەفسانە و جۆرەکانی پەرستنەکنیان بکۆڵێتەوە و تێی بگات و بەڵگەی بوونی هەر ئەفـسانە و خورافەتێك چی یە بۆئەوەی باشتی لە ڕابردوو تێبگات.

سێ یەم/ هەرچی باس و سەربردە و هەوڵ هەیـە لـە سەرچـاوەکاندا، مێـژوونووس نابێت بەم زەقییە وەریبگرێت و ووشە بە ووشە و پیت بە پیت وەریبگرێت، بـەڵکو لەسەری پێویستە سەیری بکا و شی بکاتەوە ئینجـا وەریبگرێـت بـەم جـۆرەی کـە زنجیرەیەکـە لـە ڕاسـتی تێکـەڵاوی مێـژوویی و وا هەسـت بکـات سەرچـاوەکان بـە جۆرێـك لــە شـێواوی تۆماریـان کـردووە ومێژوونووسـیش ڕێـژەی شـێواوییەکەی دیاریدەکات، هەوڵبـدرێت خوێندنـەوەی لەسـەر نووسـەری ڕووداوەکـە یـا بێـژەری ڕووداوەکە بکرێت و مەبەستی چی یە لە دیارخستنی ئەم ڕووداوە بـەمجۆرە و ئـەو هەوڵانـەی خـستویەتییە بـەردەمی خوێنـەر. ئەمـەش نزیکـە لـە لێکۆڵینـەوەکانی زانستی فـەرموودەکانی پێغەمبـەر کـە زۆر پێویـستە کەسـایەتییەکانی گێڕانـەوەی فەرموودەکان بناسرێت و تێیان بگەین ئینجا فەرموودەکان وەربگرین.

چوارەم/ ڤیکۆ پێی وایە ئەو شێوازانەی یارمەتیدەرن بۆ تێگەیشتن و شی کردنەوەی دەقە مێژووییەکان ئەوەیە گ دەبێت بە عەقڵییەتی تایبەت بە قۆناغە مێژووییەکەی دەقە مێژووییەکە سەیر بکرێت (واتە بەچاوی ئەو کات سەیری ئەو کات بکرێت) ئینجا لێی تێدەگەین. چونکە هەر قۆناغێکی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی سروشتی تایبەتی خۆی هەیە و هزری مرۆڤەکانیش لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر جیاوازییان هەیە.

—خولە بەدواداهاتەکان لای ڤیکۆ :

ڤیکۆ لە ئەنجامی قوڵبوونەوەی لە مێژووی قۆناغەکانی مرۆڤایەتیدا وای خستەڕوو کە هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆ بەدیناکرێت لەنێوان گەلاندا چونکە هەموویان وەك یەك قۆناغەکانی مێژوو دەبڕن هەرچەندە جیاوازی هەبێت لەنێوان مەڵبەندی و جوگرافی و رەگەزیان. بەڕای ڤیکۆ پەیدابوونی خێزان و ئاڵوگۆڕەکانی و دروستبوونی زمان و گەشەسەندنەکانی شێوازەکانی دەبڕین و ڕەوانبێژی و جۆری بیرکردنەوە و گۆڕانەکانی هزری و دامەزراوەکانی سیاسی و بەهێزی و لاوازیان لای سەرجەم گەلانی جیهان یەك ڕێبازییان بڕیوە و دەیبڕن، ئەو بیروڕایانەی ڤیکۆ تا کاتی ئێستاشمان بەشێك لە مێژوونووسانی ڕۆژئاوایی بڕوایان پێی هەیە و لە نووسینەوەکانیاندا هەر یەکەیان بە جۆرێك و شێوازێك پەیڕەوی دەکەن.

بۆچوونەکانی ڤیکۆ لە (تیۆریای خولە بەدواهاتەکان) بیرۆکەکەی لە کتێبی پیرۆز وەرگرتووە لەم سەربردە و چیرۆکانەی کە تیایدایە، لێرە چەند بنەمایەکی دانا بۆ تیۆریای خولە بەدواهاتەکانی مێژوو، بریتین لە:

- بەگوێرەی باوەڕی ڤیکۆ هەر قۆناغێك و سەردەمێکی مێژوویی سروشتی تایبەتی خۆی هەیە جیای دەکاتەوە لە سەردەمێك و قۆناغێکی تر، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دەتوانرێت ئاشنایەتی پەیدا بکەین لەسەر چەند تایبەتمەندییەکی نادیاری سەردەمێك لە سەردەمەکان یاخود لە قۆناغەکان لەلایەن گەلێك یان شارستانییەتیەکی دیاریکراو بەپێی پێوەری تایبەتی ناسراوی هەمان سەردەمی هاوشێوەی کە گەلێك یاخود شارستانیەکی تر پێیدا تێپەڕیووە. بۆ پتەوکردنی تیۆریاکەی ڤیکۆ نموونەی سەردەمی هۆمیرۆس دەدات لە مێژووی یۆناندا کە هاوشێوەی سەدەکانی ناوەڕاستە لە ئەوروپادا، هەردووکیانیشی بەسەردەمی (قارەمانێتی) ناوبردووە و خەسڵەتەکانی بریتین لە بوونی حکومەتێکی دامەزراوەی بۆرژوازییەتی سەربازی و بڵاوبوونەوەی ڕۆمانسییەت لە زمان و ئەدەب و ئابووری پشت بەستوو بە کشتوکاڵەوە، جگە لە تەشەنەکردنی پێوەری ڕەوشتی بەستراو بە بەهاکانی ئازایەتی و سوارچاکی و پابەندبوون، ڤیکۆ دەڵێت ئەگەر بمانەوێت ئاشنایەتی پەیدا بکرێت لە تایبەتمەندییە شاراوەکانی بۆنموونە چاخی هۆمیرۆس ئەوا دەتوانین لێکۆڵینەوە لەسەر سەدەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا بکەین بۆئەوەی بگەینە ئەنجامەکانمان.

٢- ڤیکۆ وای دەبینێت سەردەمەکان لە سەرجەم شارستانیەکان بە یەك شێواز بەدوای یەکتردا دێن، سەردەمی قارەمانێتی کە کۆتایی پێکدێت سەردەمێکی نوێ دێت جیاکاری زۆری هەیە لە قارەمانیتی کە تێیدا هزر کۆنترۆڵی خەیاڵ دەکات و پیشەسازی دەبێتە بنەمای ئابووری لە جیاتی کشتوکاڵ و ئاشتی باڵ بەسەر شەڕدا دەکێشێت، کاتێك ئەم سەردەمەش کۆتایی پێدێت

سـەردەمی بەربەریـەتی نـوێ (کێـویی نـوێ) کـە جیـاوازە و ڤیـکـۆ هـزری ئـە سەردەمە بە (هزری کێوییانە) ناودەبات ، چ هزرێك هەرچی تونـای داهێنـان و دامەزرانـدنی هەیـە زۆربـەی لـە دەسـت داوە تـەنها وەکـو هزرێکـی ڕواڵـەتی ماوەتـەوە. بـەم جـۆرەش مرۆڤایـەتی خـۆی ئامـادە دەکـات بـۆ چـوونە نێـو خولێکی نوێی شارستانییەت و بە هەمان قۆناغـەکانی پێـشووی دەڕوات بـەڵام گرنگییەکـەی لەوەدایـە کـە لـە ئاسـتێکی بـەرزتر لـە هـی پێـشووی و زیـاتر پێشکەوتووانەترە.

٣- ئەم بزاوتە بازنەییە خولە بەدواهاتەکانی شارسـتانییەت مانـای ئـەوە نیـە کـە جوڵانەوەی مێژوو وەك ڕەوڕەوەیەك بە دەوری خۆیدا بسوڕێتەوە، بـەڵکو بـە جوڵەیەکی لولپێـچی بەرەوسـەر دەچـێت چـونکە مێـژوو خـۆی لەسـەر هـەمان شێوە دووپات ناکاتەوەبەڵکو بەشێوەیەکی نوێ و جیا لە هـی پێـشووی، بـەم جۆرەش مێژوو بەلای ڤیکۆ هەمیشە لە نوێبوونەوەدایە، بۆنموونە بەربەریـەتی یۆنانی کۆن جیاوازە لە بەربەریەتی سـەدەکانی ناوەڕاسـت هـەروەك جیـاوازی بت پەرستی لە مەسیحییەت.

خولە بەدواهاتەکانی سەردەمەکانی مێژوو بەلای ڤیکۆوە بریتین لەمانە:

یەکەمیان/ سەردەمی خواوەندان:

یاخود ڕۆڵـی خواوەنـدان، گـەلان لەسـێبەری ئـەم فەرمانڕەوایانـە دەژیـان کـە یاسـاکانیان بـەناوی ویستی خواوەندنـەوە دەردەکـرد لـە ڕێگـەی سـەرکردەکانی ئاینییان و سروشەکانی کاهینەکان. بەوە دەناسرێ کە تیایدا خوارافات باڵادەستە و ترس هەیـە لـە ڕواڵەتـە سروشـتییەکان، چـونکە بـەلای مرۆڤـەوە مانـای توانـا و

ویستی خواوەندە لە باری ڕەزامەندی و باری تووڕەییدا. هەروەها بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی گیانی چاکە و گیانی خراپە و بڵاوبوونەوەی ئەفسانەکان دەسەڵاتیش لەم سەردەمەدا لەژێر دەستی پیاوە ئاینییەکانە کە بەناوی خواوەندەوە فەرمانڕەوایەتی دەگێڕن.

دووەمیان/ سەردەمی قارەمانەکان :

کاتێك فەرمانڕەوایەتی بەدەستی پاڵەوانە توند و جەنگاوەرە ئازاکانەوەیە، خەڵکی باوەڕییان وایە کە بەرزترن لە مرۆڤ و لەنێوانیاندا بۆرژوازییەت سیستەمی حوکمە، جیاکاریش بریتی یە لە خۆشەویستی بۆ پاڵەوانێتی و بەرزڕاگرتنی هێز و تواناکان، دەسەڵات لەدەستی پیاوە ئاینییەکان دەگوێزرێتەوە بۆ جەنگاوەران، بەم جۆرە هێز دەبێتە یاسای سەردەم، بەڵام سیستەمی گشتی نێو کۆمەڵگا دەبێتە سیستەمی بۆرژوازییەت لەسەر بنەمای جیاکردنەوەی سروشتی نێوان خانەدانەکان و خەڵکی گشتی.

سێیەمیان/ سەردەمی مرۆڤ :

ئەمەش لەدوای سەردەمی قارەمانێتی دێت دوای ئەوەی خەڵکی گشتی ململانێی چینایەتی ئەنجام دەدەن و داواکارن وەکو خانەدانەکان مافیان هەبێت، جگە لە بوونی یاسایەك ڕێزی بەرژەوەندییەکانیان بگرێت، لەم سەردەمەدا خەڵك دەگاتە پلەیەکی هۆشمەندێتی و توانای تێگەیشتنی ئەوەیان دەبێت مرۆڤ پێویستە بە یەکسانی بژین وەکو سروشتێکی ئاسایی مرۆڤانە و چیتر ئەوەیان پێ قبوڵناکرێت کە ڕواڵەتە سروشتیەکان پەیوەستە بە تووڕەیی یان ڕەزامەندی خواوەندەوە، دیموکراسییەت دەبێتە داوایەکی ئەم سەردەمە و لە چواچێوەیدا حکومەتی کۆماری و پاشانشینی سەرهەڵدەدات و خەڵك ڕۆڵی تێدا دەبینێت و

دوور لــە زۆردتــری، یاســاکانیش لــە خزمــەتی گــشتی و ســەرجەم چــینەکاندا دادەڕێژرێت.

ئەم خولە بەدواهاتەی مێژوو بەلای ڤیکۆ بەم سێ قۆناغە تێپەڕدەکات، کاتێك هز توانای داهێنانی نامنێنێت لە قۆناغی سێیەم واتــە ســەردەمی مــرۆڤ و ڕۆڵــی لــە ژیاندا نامێنێت ئەوا خولەکەی شارستانییەت هــەمووی کۆتــایی پێدێت، جــا چ لــە ڕێگەی هێرشی دەرەکی یان گەندەڵی تــەواوی کۆمەڵگــە، بــەم جــۆرەش کۆمەڵگــە دەگەڕێتــەوە بــۆ ئەنجامگەیانــدنی خــولێکی تــری شارســتانییەت بــە هەرســێ سەردەمەکەیەوە، سەردەمی خواوەندان و سەردەمی قارەمانان و سەردەمی مرۆڤ بەلام ولە نوێیەکە لەچاو هەرسێ سەردەمەکەی خولەکەی پێشووی خۆی بــەرزترە هەرچەندە لێکچوونێك هەیە لەڕووی ئاراستەکانیان و ڕواڵەتە گشتییەکانیان.

خولە بەدواهاتەکانی مێژوو بە هەرسێ قۆناغەکانیانەو بوون بە یاسایەك گەلان پێیــدا تێپــەڕ دەکــەن و هــەر ســەردەمەش یاســای تایبــەتی خــۆی هەیــە. یاســای سەردەمی یەکەم ئایینە کە ڕێگەچارەی تر لە بەردەست نەبوو، تەنها ئاین نــەبێت، لەبەرئەوە لەم قۆناغەدا خواوەندان گەلیان بەڕێوەدەبرد و یاســاکانیش هــەڵقوڵاوی ویستی خواوەندان دەبێت بەلای گەلان. یاســای ســەردەمی دووەم قارەمانییــە کــە بریتی یە لە یاسای هێز، لەم ڕێگەیەوە قارەمانەکان خۆیان پڕ چەك دەکەن. بەڵام یاســای ســەردەمی مــرۆڤ یاســاکانی مرۆڤانەیــە لــە ئــەنجامی گەشەســەندنی هــزری مرۆڤایەتی سەریهەڵداوە.

سەبارەت بە حکومەتەکانیش ڤیکۆ لای وا یە حکومەتــەکانی یەکــەم ئاینییــە و باوەڕ وابوو هەموو شتێك بۆ خواوەندان دەگەڕێتەوە، بــەڵام حکومەتــەکانی دووەم قارەمانێتییە یان بۆرژوازییەتە هێز بەســەریدا زاڵــە و جیــاوازی چینایەتی تیادایــە،

چونکە خانەدانەکان خۆیان بە خاوەن ماف دەزانن و پێیان وایە چینی گشتی دواکەوتوو و نەفامن و دەبێت خۆیان بەڕێوەیان ببەن، بەڵام حکومەتەکانی سێیەم حکومەتی مرۆڤەکانە، و بەوە جیادەکرایەوە یەکسانی و دادپەروەری تێدایە.

لەبەرامبەریشدا سێ جۆر لە زمانەکان هەیە، زمان لە سەردەمی یەك یان قۆناغی یەکەم ئاینییە، زمانێکی کەمدوو پیرۆزە، وەکو نموونەی میسرییە کۆنەکان لە زمانی هیرۆگلیفی. بەڵام زمان لە سەردەمی دووەمدا زمانێکی هێمایی و نیشانە و دروشمییە، زمانی سەردەمی سێیەم زمانی لێدوان ودەربڕینە کە سەرجەم گەلان لە کاتی ئێستادا بەکاری دەهێنن.

یاساکانی هەرسێ سەردەمەکەی خولە بەدواهاتەکان ئاوێنەی سەردەمەکەی خۆی بووە، یاساکانی خواوەندێتی و پاشان قارەمانێتی بە توندوتیژی جیادەکرایەوە، بەڵام ئەم یاسا توندانە بەرەو نەرمی چوو لەگەڵ گەشەسەندنی سەردەمە مێژووییەکان بۆئەوەی بگونجێت لەگەڵ باری کۆمەڵایەتی و ڕەوتی ژیانی خەڵك و ئازادی گەلان و ئەمەش ڕەوتی ژیانی نەتەوەکانە. سەبارەت بە پارێزگاریکردنی یاساکان کە زیاتر تایبەتمەندە لە بۆرژوازییەتی قارەمانێتی بوو جەختی لەسەر دەکردەوە، بەڵام لە ڕاستیدا دەستپێکی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاینی، کە یاسا ئاینییە پیرۆزەکان بڵاویان کردبووەوە، لە سەردەمی قارەمانێتی توندوتیژی پەیڕەوکرا لە پارێزگاریکردن و جێبەجێکردنی، بۆئەوەی قارەمانەکان و خانەدانەکان لەڕێگەیەوە ملکەچی خەڵکی پێ بکەن، بۆ بەرژەوەندی خۆیان.

لەدرێژەی تیۆرییەکەیدا ڤیکۆ جەخت دەکاتەوە دەڵێت ژیانی گەلان و تێپەڕبوونی بە هەرسێ قۆناغە مێژووییەکە ئاراستەکەی سروشتیانەیە و

دابونەریتی سروشتی بە تاکە پاڵنەرێك ناگۆڕێت بەڵکو هەنگاو بە هەنگاو دەگۆڕێت ماوەیەکی درێژی گەرەکە، هەروەها سنوری جیاکەرەوە نیە لە نێوان هەر سێ قۆناغە مێژووییەکە بەڵکو جۆرێك لە پەیوەستی سروشتی هەیە لەنێوانیاندا، دەبینین لە هەر قۆناغێك کاریگەری قۆناغی پێش خۆی لەسەرە، ڤیکۆ دەڵێت لە قۆناغی خواوەندێتیدا ڕێژەیەکی بەرچاوی چینی کێوییانە و توندوتیژییان کە تایبەت بە سەردەمی بەربەریەت ئەوان پاراستیان و جێ بە جێیان دەکرد، و لە سەردەمی قارەمانێتی تاکڕەوی فەرمانڕەوایەتییان دەکرد و بەجێ بەجێ کردنی چەندین سیاسەتی سەردەمی خووەندێتی لەلایەن قارەمانەکان و بنەماڵەی قارەمانەکان. وە بۆ جێ بەجێ کردنی بەرژەوەندی گشتی خەڵك لە هەوڵداندابوون کە خۆیان بتوانن حکومەتی نیشتمانی لە سەردەمی مرۆڤ پێکبهێن، بەڵام لێرەدا کەسایەتییەك دەردەکەوێ بانگهێشتی ئازادی و ڕزگاری و چاکسازی دەکات و هەوڵدەدت بۆ جێبەجێ کردنی بەرژەوەندیی گشتی، بەڵام بەچی؟ بە هێز و چەك، دوای ماوەیەك بۆ خەڵکە گشتییەکەش ئەوەندە بەس دەکات هەوڵ بدەن بەدوای کارە تایبەتییەکانی خۆیاندا بچن و پەیوەندییان بە سیاسەتی گشتییەوە نەبێت.

سەرجەم کۆمەڵگە مرۆڤایەتییەکان بەم سەردەمانەدا تێدەپەڕن و هەمیشە دووبارە دەبنەوە کە کۆتاییەکەی بە سەرەتاکەیەوە پەیوەستە -واتە قۆناغی گواستنەوە- ڤیکۆ پێی وایە خولە بەدواهاتەکان جارێکی تر بە ڕووخانی سەردەمی مرۆڤ کۆتایی پێدێت و لەوێشەوە هەنگاو دەنرێت و دەگوازرێتەوە یەکەم قۆناغی خولەکە کە قۆناغی بەربەرییەتە، و بەم جۆرە قۆناغەکانی تریش تێپەڕ دەکات و جارێکی تر لە کۆتایی قۆناغی سێیەم کۆتایی دێت و تا دوایی، بەڵام ڤیکۆ ماوەی بەسەرچوونی سەردەم و قۆناغەکان دیاری ناکات و لەتوانادا نییە ماوەکان دیاری بکرێن.

سەبارەت بە ڕۆڵی چاودێری خواوەندەوە (العنایە الالهیە) بۆ ئاراستەی مێژوو، بەلای ئەوەوە خواوەند ڕۆڵی خۆی هەیە، دیارە ڤیکۆ کاریگەری وەك کەسایەتییەکی ئاینی کاسۆلیکی و باوەڕی تەواوی بە ڕۆڵی خواوەندێتی لە کتێبی پیرۆز وەرگرتووە، بەلای ئەو نەتەوەکان هەرچەندە مێژوو تۆماردەکەن ومرۆڤەکان ئازادن لە هەڵبژاردنی کارەکانیان، بەڵام ئەم ئازادییە جێبەجێ ناکرێت تەنها لەژێر ڕێپێدانێکی دیاریکراوی چاودێری خواوەندەوە نەبێت، و ئەگەر ڕۆڵی چاودێری خواوەند نەبووایە ئەوا ئاراستەی مێژوو بەم جۆرەی کە بووە نەدەبوو، هەر ئەم چاودێری خواوەندەیە کە لەدوای جەنگ و شۆڕش بۆ چارەسەرکردن و لەژێر چاودێری خواوەندەوە تاکێك لەنێو کۆمەڵگە ڕادەپەڕێت و کۆمەڵگەکە لە تێکچوون دەرباز دەکات، یاخود کۆمەڵگەیەك زاڵدەکات بەسەر کۆمەڵگەیەکی تر کە لەو باشترە و بەهێز داگیریدەکات، یاخود لەڕێگەی سێیەم چاودێری خواوەند بەشداری دەکات کە بریتییە لە لەناوبردنی تەواوی کۆمەڵگە ئەگەر دوو چارەسەرەکەی یەکەم سوودی نەبوو.

- سەرنج و تێبینی لە تیۆری ڤیکۆ :

١- بۆ جێبەجێ کردنی تیۆریاکەی و ڕێبازەکەی ڤیکۆ زیاتر ڕەخنەی ئەوەی لێدەگیرێت کە پشتی بە کتێبی پیرۆز و چیرۆکەکانی بەستووە لە مێژوو و شارستانییەتە کۆنەکاندا.

٢- ڤیکۆ وایدەبینێ سەرهەڵدان و دەکەوتنی دەوڵەتان و شارستانییەکان، فاکتەرەکانی دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری بایلۆجی واتە وەکو ئەوەی کە مێژوو نووسی ناودار (ابن خلدون) کردوویەتی لە لێکچوونکردنی دەوڵەتان و شارستانییەکان بە ڕووەك و ئاژەڵان و هەردەبێ بە قۆناغە دیاریکراوەکانی ژیاندا تێپەڕبن.

٣- تیۆریاکەی ڤیکۆ لە خولە بەدواهاتەکان کە شارستانییەت و دەوڵەتان پێدا تێپەڕ دەکەن شێواوی زۆری تێدا بە دیدەکرێت لە ڕاستییە مێژوویییەکان، جگە لەمە قۆناغەکان تێکهەڵکیشی و پەیوەندی زۆریان لەگەڵ یەکتردا هەیە.

٤- بەشێك لە مێژوونووسان ڕەخنەی ئەوەی لێدەگرن کە دەمارگیری ئاینیی مەسیحییەتی کاسۆلیکی هەبووە و ڕەنگدانەوەی خۆی هەبووە لە تیۆریاکانی لە فەلسەفەی مێژوودا.

٥- بەڕادەیەکی زۆر بیروبۆچوونی چاودێری خواوەندی بەکارهێناوە لە لێکدانەوەی بۆ ڕووداوەکانی مێژوو بە شێوەیەکی نادیار و ناڕوون.

٦- سەرجەم بیروڕاکانی ڤیکۆ بەلای بەشێك لە مێژوونووسان لە دەرەنجامی خوێندنەوەیەکی گشتگیری مێژوویی نەبووە بۆ ڕووداوەکانی مێژوو جگە لەمە زۆر لە بیروڕاکانی شیکاری بۆ کراوە لەپێش خۆی، بەڵام ئەوە بە قووڵتر لە بەشێکیدا چۆتە ناو باسەکانەوە.

سەرچاوەکان :

د. أحمد محمود صبحي:

١- فلسفة التأريخ، مؤسسة الثقافة الجامعية، (الاسكندرية: ١٩٧٥).

آلبان ج. ويدجري:

٢- التأريخ و كيف يفسرونه من كونفوشيوس الى توينبي، ترجمة: عبدالعزيز توفيق جاويد، الهيئة المصرية العامة للكتاب، (القاهرة: ١٩٧٢).

٣- المذاهب الكبرى في التأريخ، ترجمة: ذوقان قروط، (بيروت: ١٩٧٩).

د. جميل موسى النجار:

٤- دراسات في فلسفة التأريخ النقدية، دار الشؤون الثقافة العامة، الطبعة الأولى، (بغداد: ٢٠٠٤).

٥- فلسفة التأريخ مباحث نظرية، المكتبة العصرية، الطبعة الأولى، (بغداد: ٢٠٠٧).

د. رأفت الشيخ:

٦- تفسير مسار التأريخ نظريات في فلسفة التأريخ، عين للدراسات و البحوث الانسانية و الاجتماعية، (القاهرة: ٢٠٠٠).

د. كمال مەزهەر ئەحمەد:

٧- مێژوو، کورتە باسێکی زانستی مێژووی کورد و مێژوو، مطابع دار آفاق عربية، (بەغدا: ١٩٨٣).

د. مصطفى النشار:

٨- فلسفة التأريخ، شركة الأمل للطباعة و النشر، الطبعة الأولى، (د.م: ٢٠٠٤).

د. مفيد كاصد الزيدي:

٩- المـدخل الى فـسلفة التـأريخ، دار المنـاهج للنـشر و التوزيـع، الطبعـة الأولى، (عمان: ٢٠٠٦).

د. هاشم يحيى الملاح:

١٠- المفصل في فلسفة التأريخ، دار الكتب العلمية، الطبعة الأولى، (بيروت: ٢٠٠٧).

د. هاشم حيى الملاح و آخرون:

١١- دراسات في فلسفة التأريخ، دار الكتب للطباعة و النشر، (الموصل: ١٩٨٨).

# شۆرشی پیشەسازی لە ئەوروپادا لە نیوەی دووەمی سەدەی ( ١٨ ) و نیوەی یەکەمی سەدەی ( ١٩ )ی زاینی دا

بەشدار عمر رفیق
خوێندکاری ماستەر/زانکۆی کۆیە

- چەمکی شۆرشی پیشەسازی :

شۆرشی پیشەسازی لە ئەوروپا ئاماژەیە بۆزنجیرەیەك گۆران کاری . کە ئەوروپا لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەونیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە بە خۆیەوە بینی . (١) هەرچەندە دەستەواژەی شۆرش زیاتر بەکار دە هێنرێت بۆ گۆرانکاری لە ناکاوو خێرا . بەلآم بەکارهێنانی لە پالّ ئەو زنجیرە پێشکوتنە پیشەسازیەی ئەوروپا . لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەم مەبەست لێی گۆرانکاریەکی کاریگەری لەسەر خۆو یەك لە دوای یەکە. (٢)

ئەو زنجیرە گۆرانکاریە پێشکەوتنی شێوازو چۆنیەتی پیشەسازی کردنی گرتەوە. کەسەرەتا لە بەریتانیاوە دەستی پیّ کردوو لە دوایدا بە تێپەربونی کات ولآتانی ئەورووپاو باکوری ئەمریکاو ئەفریقاو ئاسیاشی گرتەوە . سەرچاوەو هۆکاری تازەی هێنایە ئاراوە بۆگواستنەوەو کارکردن و دابین کردنی

پێداویستیەکانی ژیانی کۆمەڵگاو پەیوەندی کردنی و بەرهەم هێنانی و سەرجەم بوارەجیاکانی تر ، بە هۆی داهێنانی ئامێری کشتوکاڵی و بەکارهێنانی لەبواری کشتوکاڵی دا لەبەریتانیا لەسەرەتا بەناوی شۆرشی کشتوکاڵی و لە بواری بازرگانیش بەشۆرشی بازرگانی ناوی دەبرا . بەڵام کاتێك لەبواری پیشەسازی جۆراوجۆردا پێشکەوتن و گۆرانی جۆراوجۆری بەرچاوی بنیات نا زاراوەی شۆرشی پیشەسازی ناسراویی خۆی وەرگرت .(٣)

هۆکارەکانی سەرهەڵدانی شۆرشی پیشەسازی لەبەریتانیا:-

ئەگەر سەیر بکەین شۆرشی پیشەسازی وەك ئاماژەمان پێدا لەسەرەتا لەبەریتانیا سەری هەڵداو گەشەی بە خۆوە بینی ، لە دوایدا بە تێپەربونی کات گوازرایەوە بۆوڵاتانی تری دونیا ، گرنگترین ئەو کارانەش کەرۆڵی سەرەکیان تێیدا بینی بریتی بوون لە :-

١- کاریگەری شوێنی جوگرافی بەریتانیا:-

بەریتانیا کە پێکهاتوە لە چەند دورگەیەك لە زەریای ئەتڵەسی داو دەریای (ئەلمانش ) جیای دەکاتەوە لە کیشوەریئەوروپا ، ئەم هەڵکەوتە جوگرافیەی لەزۆر لایەنەوە یارمەتی دەری باشی بەریتانیا بووە بۆسەرهەڵدانی شۆرشی پیشەسازی لەم وڵاتەدا، لەوانە ئاوو هەوایەکی مام ناوەندی هەیە لە وەرزی هاوین دا، وەرزی زستانیشی یەکجارساردێکی زۆر نابێت رێگە لە چالاکی کارو کردار بگرێت لەو وڵاتانەدا، جگە لەوەی مرۆڤ لەوجۆرە ئاوو هەوایە دا زۆر چالاك دەبێت بۆکارکردن . لەلای ترەوە ئاوو هەوایەکی شێداری هەیە یارمەتی پیشەسازی رستن و چنینی ی زۆرداوە لەوسەردەمەدا . کەپێویستی بە هەوای شێدار هەبوە. (٤)

٢- سەقامگیری بارو دۆخی سیاسی:-

بەریتانیا وڵاتێکە دور بووە لە کودەتای سەربازی ناوخۆیی سەرەرای ئەمەش ئەو هەڵچون و داچونە سیاسی و سەربازیەی وڵاتانی ئەوروپای گرتەوە لە ئاکامی جەنگەکانی ناپلیۆن داکاری نەکردە سەر بەریتانیا.(٥) کاتێکش شۆرشی ساڵی ١٦٨٨ز لەو وڵاتەسەری هەڵدا بوە هۆی چەسپاندنی دەسەڵاتی پاشایەتی و پەرلەمان، بەپێی یاسای بەریتانیا بەهیچ جۆرێك دەولەت دەستی لەکاروباری ئابوری وڵات وەرنەدا تەنها لە حالەتی پێویستی دانەبێت بۆئەنجام دانی چاکسازی . وەلە یاسادا هاندانی تاکە کەس و سەرمایە دارانی بۆبەر هەم هێنانی تێدابوو (٦).

٣- زۆربونی ژمارەی کرێکاران و کارکردنیان بە نرخێکی هەرزان:-

لەکاتێکدا لە نیوەی دووەمی سەدەی (١٨) دا کۆچ کردن بە ڕادەیەکی زۆر لە لادێکان بۆ شار دەستی پێ کرد ، بوو بە هۆی زۆربوونی دەستی کارکەر لە شارەکاندا ، بە تایبەتی ژنان و منداڵان لە کارکردندا پێشبڕکێی پیاوانیان دەکردو تەنانەت بە کرێی کەمتریش کاریان دەکردو گوێڕایەڵ تریش بون بۆ خاوەن کارەکانیان. (٧) ئەم خاڵەش هانی سەرمایە دارەکانی دا تا هەوڵی دامەزراندنی دەیان پرۆژە بدەن، چونکە دەستی کار زۆر گرنگ بوو لە گەڵ ئەوەشدا هەرزان و زۆر بوو. (٨)

٤- بوونی ژمارەی زۆر لە سەرمایەداران :-

بێگومان بەریتانیا ژمارەیەکی یەکجار زۆری لە سەرمایەداران تێدا بوو کە خاوەنی سەرماییەی زۆر بوون ، بە هۆی کاری کشتوکاڵ و بازرگانیەوە. (٩) کاری پیشەسازیش کە خۆی لە کڕینی ئامێرو دامەزراندنی کارگەو کڕینی مادەی

سەرەتایی بۆ پیشەسازی و دابینکردنی کرێکار دەبینیەوە ، بووە هۆی ئەوەی بەریتانیا زیاتر لە ولأتانی تری ئەورووپا بتوانێت بایەخ بەو بوارە بدات و تێیدا پەرە بسێنێ، چونکە سەرمایەکانیان لەو بوارە دا خەرج دەکرد.(١٠)

٥- پێشکەوتن و گەشەکردنی بازرگانی :-

بە هۆی یاسای بەریتانیای ساڵی ١٧٠٧ز بەریتانیا بوو بە بازارێکی کراوە بۆ بازرگانی کردن لە گەڵ سەرجەم ولأتانی ئەورووپاو باکوری ئەمریکاو ئەفریقاو ئاسیا .(١١) زۆری فرۆشتنی بەرهەمەکانی بەریتانیا لە بازارە ناوخۆیی و دەرەکیەکاندا هانی بەریتانیای دا زۆر بە خێرایی کەرەستەی بەرهەم هێنراوی زۆر زیاد بکات .(١٢) گەشەکردنی بازرگانی بەریتانی بەو ئەندازە زۆرە بە تایبەتی خواستی زۆر لە سەر دروستکراوی بەریتانی هانی پیشەسازی بەریتانی دا بۆ زیاتر بەرهەم هێنانی دروستکراوەکانی بە تایبەتی لە داگیرگەکانی بەریتانیا. (١٣)

٦- پێشکەوتنی بزوتنەوەی داهێنان :-

لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دا . بەریتانیا پێشکەوتنێکی بەرچاوی بە خۆوە بینی لە لایەنی هونەری دروستکردنی ئامێرەکانەوە . بە تایبەتی ئەو ئامێرانەی بونیان پێویست بوو بۆ بنیادنانی کاری پیشەسازی بەرفراواندا وەك ئامێرە جۆراو جۆرەکان .(١٤) وە بەکارهێنانی هەڵم بۆ کارپێکردنی ئامێرە دروستکراوەکانی وەك ئاسیاو (ئاش) و تورمپا کە سوودی یەکجار زۆر یان لەو سەردەم لێ وەرگیراوە بە تایبەتی تورمپا ، ئاویان بۆ دەیان لە شارەکان پێ دەگواستەوە . جگە لە بەکارهێنانی ئاسن لە دەیان بواری تری داهێنان دا کە بەریتانیا لەو سەردەم بەخۆیەوە بینی. (١٥)

٧- زۆری کانەکان لە بەریتانیادا :-

بوونی ڕێژەی یەکجار زۆر لە کانی خەڵوزی بەردین و ئاسن ڕۆڵی کاریگەری بینی لە سەر هەڵدانی پیشەسازی و سەرکەوتنی لە بەریتانیادا چونکە خەڵوز لەو سەردەم کەرەستەی سەرەکی بوو بۆ بەدەست هێنانی وزەی گەرمی ، کە کارگەکان یەکجار زۆریان پێویست بوو. (١٦) لە لای ترەوە نزیکی کانەکانی خەڵوز لە نزیك کانگاکانی ئاسن هۆکاری سەرەکی سەرکەوتن و پێشکەوتنی پیشەسازی بوو، چوونکە پێویستی بە وزەی زۆر هەبوو کە سەرچاوەکەشی خەڵوز بوو لە لای ترەوە گواستنەوەی ئاسن بوو تێچوونی کەم بوو. (١٧)

تایبەتمەندی و رواڵەتەکانی شۆرشی پیشەسازی :

١- بە دیارکەوتنی دامەزراوەی پیشەسازی :-

تایبەت مەندی کارگەکانی بەرهەم هێنان بە زۆری بەرهەم و کەمی تێچون ، بووە هۆی زۆربونی قازانجی سەرمایەداران ، ئەوانیش سەرمایەکانیان و قازانجە زۆرەکەیان لە دامەزراندن و پێشخستنی کارگەی نوێ دا بە خەرج دەدا. (١٨) ئەمەش بووە هۆی گواستنەوەی کارگە دەستیە بچوك و ناومالیەکان بۆ کارگەی گەورەو بەرهەم دار لە ناوشارەکاندا. (١٩)

٢- داهێنانی ئامێرە جۆراو جۆرەکان:-

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دا بەریتانیا پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی لە داهێنانی ئامێری جۆراو جۆری وەك ئامێرەکانی رستن وچنین.(٢٠) ئەوئامێرانەی لەبوارەکانی تری پیشەسازی بەکاردەهێنران ، سەرەرای ئامێری هەڵمی کە (توماس نیومان)ی بەریتانی دایهێنا و لەبوارە جیا جیاکاندا بەکاردەهات ، جگە لە ئامێرەکانی گواستنەوەو پەیوەندی کردن.(٢١) بایەخی

ئامێرە کشتوکاڵیەکان لەوسەردەمە رواڵەتێکی تری دیاری شۆرشی پیشەسازی بوو.(٢٢) بەڵام نابێت ئەوە لەیاد بکرێت کە بواری رستن و چنین بە تایبەتی سوف بەهۆی پێویست بونی زۆر پێی لەو سەردەمە دا ، زیاتر لەسەردەمی بوارەکانی ئامێری داهێنراوی تێدا بەکار دەهات ، تەنانەت هەندێ جار بەسەدەی سوف و لۆکە ناودەبرێت لەبەریتانیاو ئەوروپادا .(٢٣) هەموو ئەمانەش لەدەرئەنجام کەڵەکەبونی سەرمایەو سەرهەڵدان و بەدیارکەوتنی سەرمایەداری گەورەی بەدوای خۆیدا هێنا لە ئەوروپا بەگشتی و لەبەریتانیا بە تایبەتی.(٢٤)

دەرئەنجامەکانی شۆرشی پیشەسازی :

١- دەرئەنجامی کۆمەلایەتی :-

بەهۆی دامەزراندنی کارگە زۆرو جۆراو جۆرەکان لە ناوشارە کانداو زۆربونی کار لەشاردا . بوە هۆی دەسپێ کردنی کۆچ کردن بەرادەی یەکجار زۆر لە لادێکانەوە بۆ ناو شارەکان .(٢٥) بەمەش ژمارەی دانیشتوان لە شارەکاندا بەرادەی یەکجار زۆر زیادی کرد ، جگە لەوەش رێژەی لەدایك بوون زۆر بەرز بووە.(٢٦) بە بەراورد لە گەڵ رێژەی مردن دا ئەویش لەبەرئەوەی بایەخ دەدرا بەلایەنی تەندروستی گشتی.(٢٧)

بەڵام ئەوەی گرنگەلێرەدا ئەوەیە کە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم دا لە ئەنجامی ئەم کۆچکردنی بەلێشاوەدا بەتایبەتی لە بەریتانیادا، بووە هۆی ئەوەی گەورەترین و بەتواناترین جوتیارانی زەوی و زارەکانی بەریتانیا واز لەکاری کشتوکاڵی بهێنن و رو بکەنە شارەکان بۆ کارکردن لە کارگەکاندا ، ئەم کارەش دەرئەنجامی خراپی لێ کەوتەوە بەکەم بونەوەی رێژەی بەروبومی کشتوکاڵی و نرخی لەبازاردا زۆربەرز بۆوە. لەلای ترەوە کێشەی نیشتەجێ بوون سەری هەڵدا

بە هۆی زۆربوونی دانیشتوان تاوای لیهات خەڵکی لە شارەکاندا ناچاربوون لە
شوێنی بێ خزمەت گوزاری وشوێنی بچوك نیشتەجێ بن، ئەمەش دەیان کێشەی
کومەلایەتی بەدوای خۆیدا هێنا ، سەرەرای کارپێکردنی ژن و منداڵان لەکارگەکاندا
بووە هۆی ئەوەی ژنان بێ ئاگابن لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان و منداڵانش
ئەگەر چی نەوەی دا هاتون بەلام بە هۆی کارکردنیان زۆریان لەپرۆسەی خوێندن
بێ بەش بون . هەروەها دەیان گرفتی گەورە لە نێوان خاوەنی کارو کرێکاران
لەسەر سەعاتی کارو بری پارەکانیان سەری هەڵدا .(٢٨)

٢- دەرئەنجامی ئابوری و سیاسی:-

بەهۆی زۆربونی سامان لەبەریتانیا لەدەر ئەنجامی شۆرشی پیشەسازی دا
وەك ئاماژەمان پێ دا ، دامەزراوەی یەکجار زۆری بەرهەم هێنان دامەزرا لە بەشە
جیاجیاکانی بەریتانیادا ، لە سەدەی نۆزدەو بیست .(٢٩)

ئەم دامەزراوە پیشەسازی یانە گومانی تێدانیە مادەی سەرەکی کارکردنیان
بریتی یە لە کەرەستەی خاوی پیشەسازی ،ئەگەر چی بەریتانیا لە کەرەستەی
خاوی پیشەسازی هەژارنەبوو بەلام داواکاری لەسەر کەرەستەی خاو لە توانای
بەریتانیا زیاتر بوو، لە پێناوی بەدەست خستنی کەرەستەی خاو بزوتنەوەی
داگیرکاری لە ئەوروپا سەری هەڵدا.(٣٠) لەلای ترەوە هەوڵ دانی وڵاتانی
پیشەسازی بۆدۆزینەوەی بازار لە پێناوی ساغ کردنەوەی بەرهەم هێنراوەکانیان ،
چەندین بزوتنەوەی داگیر کاری لەلایەن دەوڵەتە پیشەسازی و سەرمایەدارەکان
کەوتە چالاکیْ.(٣١) کەواتە ئەگەر چی لە سەرجەم پێشکەوتنەکانی بواری
تەکنەلۆجی و ئابوری بنەماکانی دەگەرێتەوە بۆ دەست پێشخەریەکانی ئەوروپا
کە لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم بەخۆیەوە بینی . بەلام بە دیوەکەی تریشدا

بەرژەوەندیە ئابوریەکان دەیان جەنگی خوێناوی نێوان ولآتان و لە دوایشدا جەنگی جیهانی بە دوای خۆیدا هێنا لە پێناوی پاراستنی تەوازنی ئابوری لە لایەن دەوڵەتە زلهێزەکانەوە ، لەسەر حیسابی دەوڵەتە بچوك و کەم تواناکان لە ڕووی سیاسی و سەربازیەوە .

سەرچاوەو پەراوێزەکان :-

١- محمد محمد صالح، یاسین عبدالكريم، نوري سامرائي: تاريخ اوربا في القرن التاسع عشر، (بغداد : ١٩٨٥)،ص ٥١.

٢- كارلتون .ج.هـ. هيز: الثورة الصناية ونتائجها السياسية والاجتماعية، ترجمة ( احمدعبدالباقى )، الطبعة لثانية، منشورات مكتبة المثنى/ بغداد، ( د . ت)، ص ١٦.

٣- فاضل حسين، كاضم هاشم نعمة: التاريخ الاوربى الحديث (١٨١٥ - ١٩٣٩ )، الطبعة الاولى، العراق ١٩٨٢، ص ١١٥.

٤- محمد محمد صالح، ياسين عبدالكريم، نورى سامرائي: المصدر السابق، ص ٥٤.

٥- محمد محمد صالح، ياسين عبدالكريم، نورى سامرائي: المصدر السابق، ص ٥٢.

٦- عبدالمجيد كامل عبداللطيف: الوجيز فى التاريخ اوروبا الحديث ( ١٧٨٩ - ١٩١٤ ) الكتاب الخامس، بغداد، ٢٠٠٨، ص ٧٠.

٧- جامعه باتريس لومومبا للصداقة بين الشعوب: عرض اقتصادي تاريخي، الجزء الثانى، مكتب التحرير، بغداد، ص٦٠.

٨-جان ثاثي: القوانين الاساسية للاقتصاد الرأس مالي، ترجمة الى اللغة العربية محمد خليل قاسم، سعيد كامل، حليم طوسون)، ص ٦٢.

٩- عبد المجيد كامل عبداللطيف: المصدر السابق، ص ٧٠.

١٠ - فاضل حسين، كاضم هاشم نعمة: المصدر السابق، ص ١١٦.

١١- فاضل حسين، كاضم هاشم نعمة: المصدر السابق ، ص ١٢٠.

١٢- محمد محمد صالح، ياسين عبدالكريم، نورى سامرائي: المصدر السابق ، ص ٥٤.

١٣- عبدالمجيد كامل عبداللطيف: المصدر السابق، ص ٧١.

١٤- فاضل حسين، كاضم هاشم: المصدر السابق، ص ١٧.

١٥- حبغربزون: تاريخ أوربا الحديث، ترجمة (على المزوقى )، الاهلية، ص ٤٩٦.

١٦- محمد محمد صالح، ياسين عبدالكريم، نورى سامرائي: المصدر السابق، ص٥٥.

١٧- عبدالمجيد كامل عبداللطيف: المصدر السابق، ص٧٣.

١٨- محمد محمد صالح، ياسين عبدالكريم، نورى سامرائى: المصدر السابق، ص٦٠.

١٩- عبدالفتاح حسن ابوعلية: تاريخ أوربا الحديث والمعاصر، دارالمريخ، للنشر، الرياض، ٢٠٠٧، ص٢٨١.

٢٠- جان ثاثى..ج. هـ .هيز : المصدر السابق ، ص ٥٨.

٢١- عبدالفتاح حسن ابوعلية: المصدر السابق ، ص ٢٨٠ .

٢٢- جان ثاثى. ج. هـ .هيز: المصدر السابق، ص ٥٨.

٢٣- فرناند برويل: تاريخ القواعد الحضارات، ترجمة(حسين شريف) مصر، ١٩٩٩ ، ص٤٤٣.

٢٤- جان ثاثى .ج.هـ .هيز : المصدر السابق ، ص ٥٨.

٢٥- عبدالفتاح حسن ابوعلية: المصدر السابق ، ص ٢٨٣ .

٢٦- فرغلى على تسن: تاريخ أوربا الحديث والمعاصر من عصر النهضة الاوربية الى مابعد الحرب العالمية الثانية، طبعة الاول،دارالوفاء، الاسكندرية، ٢٠٠٢، ص١٣.

٢٧- محمد محمد صالح، ياسين عبدالكريم، نورى سامرائى: المصدر السابق، ص٦١.

٢٨- عبدالفتاح حسن ابوعلية: المصدر السابق، ٢٨٢.

٢٩- فاضل حسين كاضم هاشم: المصدر السابق، ص١٣٦.

٣٠- محمد محمد صالح، ياسين عبدالكريم، نورى سامرائي: المصدر السابق، ص٦١.

٣١- فاضل حسين كاضم هاشم: المصدر السابق، ص١٤٣.

# چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی ئەوروپای سەدەكانی ناوەڕاست

ن: ئامانج نازم بیجان

باشووری كوردستان

تەوەرەی چوارەم :–بەشێك لە دیاردەكانی كەنیسەی مەسیحی.

أ/ پایەكانی پیاوانی ئایینی وبەڕێوەبردنی كاروباری كەنیسەی مەسیحی :–

پێویستە لە یادمان نەچێت، بە نەمان و لە نێو چوونی دەوڵەتی ئیمپراتۆر، ئیدی كەنیسەی كاتۆلیكی جێگەی ئیمپراتۆر دەگرێتەوە لە ڕۆمادا، چونكی كەنیسەی مەسیحی بۆ خۆی لە ژێر سایەی ئیمپراتۆری ڕۆمانی كۆن دا دەركەوت[1]، كەواتە ئەم قۆناغە لە پاش ئەو ماوەیەدایە كەوا دەسەڵاتی كەنیسە بەیەك جارەكی فراوان و كەورە دەبێتەوە، و دوڵەتی كە نیسەی سەربەخۆش دروست دەبێت، وهەروەها كۆمەڵگاش بە شێوەیەكی گشتی كەوتە ژێر كاریگەری و هەژموونی ئەو قەوارە نوێیە كە تازە لە دایك بووە! وەهەر ئەم قۆناغ و ماوەیە بوو كەوا پاڵی بە كەنیسە و پیاوانی نا، كەوا پایەیان دیاری بكرێت لە كاروباری بەڕێوەبردنی كەنیسەی مەسیحی لە ئەورووپادا، یاخود دەتوانین بڵێین كە بەفراوان بوون و جێگیر بوونی كە نیسە، وایدەخواست كە پیاوانی ئایینی ببن بەخاوەن پلەوپایە، و ئەو جۆرە پۆستانە وەربگرن، وە هەروەها دواتر ئەم دەسەلات و جێگیبوونە لە كەنیسەوە دەگوازرێتەوە بۆ بوارو لایەنەكانی تری ژیانی كۆمەڵگای ئەورووپی، بێ گوومان ئەو كەسانەی كەوا سەرقاڵی بەڕێوەبردن و

خزمەتكردنی كاروباری كەنيسە و دەوروبەری كەنيسە دەبوون، كەسانێك بوون كەوا لە سەر بنەما و لێهاتوويی ولێشياوی بووە، وە هەريەكێك لەو پياو و ئافرەتانەی كە لە دەورو خوولی كەنيسەدا كاريان دەكرد، هەريەكەيان بە ئيش و كارێكەوە خەريك بوون، وە هەروەها هەريەكێكيان خاوەن پلەوپايەيەك بوون كەوا كەنيسەی مەسيحی پێيان بەخشی بوو، بەلاّم لەسەرووی هەموويانەوە بابابوو، دەبێت بزانين پلەوپايەكانی كەنيسە زۆربەی زۆری بۆ پياو هەبوو كە وەريان بگرێت، ياخود دەتوانين بلێين ڕێژەيەكی كەم لە ئافرەتان بۆيان هەبووە كەوا پشك داربن لەو پۆست و پلە و پايانەدا، بۆ نموونە لە (ڕەبەن )ەكان بۆ ڕەگەزی مێ هەبووە كەوا بكاتە ئەو پلە و پايەيە وخزمەت بە كەنيسە بكات، ئەمانەش لاسايی (مە سيح) و دايكی (مە ريم)يان دەكردە وە، بەلاّم بە شێوەيەكی گشتی زۆربەی پلە وپايەكانی تر تەنها بۆ ڕەگەزی نێر هەبووە وەريان بگرێت.

جا بۆيە لە بەڕێوەبردن دا سيستەمی هەرەمی پەيرەو دەكرا، وە هەروەها (پاپا) لە لووتكەی ئەم هەرەمەدا بوو، وەبالاّترين دەسەلاّتی هەبووە ولە لايەن ئەنجوومەنی كاردينالّەكانەوە هەلّدەبژێردرا، وەپاش پاپاش (كاردينالّەكان) دەهاتن كەوا ياريدەدەری پاپا بوونە لە كاروباری بەڕێوەبردندا، و لەدوای ئەمەش (سەرۆكی ئوسقوفەكان) دەهاتن، وەسەرۆكی كەنيسەی هەرێمێك بووە، وە چەند كەنيسەيەكی لە بەردەست دا بووە[٢]، وەبەشێك لە سەرۆكی ئوسقوفەكان فەرمانڕەوايی چەندين شار ياخود هەرێميان دەكرد[٣]، وەلە دوای سەرۆكی ئوسقوفەكانيش، (ئوسقوف) دەهات وە پاشان (قەشەكان) دەهاتن كەوا كاروباری بەڕێوەبردنيان گرتبووە ئەستۆ، جابۆيە بە فەرمانبەری دونيايی دەناسران، وە هەروەها ئەو (ڕاهيب) و(موريد)انەش كەوا لە دێرەكاندا دەژيان و بە ئەركە

ئاینییەکان هەڵدەستان، بە فەرمانبەری ڕۆحی دەناسران[٤]، لێرەدا واتە لەم هەرەمەدا ڕیزبەندییەکی زۆر باش و ڕێکخراوو بەدی دەکرێت بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری ڕۆژانەی کەنیسەی مەسیحی (کاتۆلیکی)، وەهەر لەخوارەوە کە پلەیەکی نزمەو پلەبەپلە بەرزو باڵا دەبێتەوە هەتاوەکو دەگاتە لووتکەی هەرەمەکە، کەئەم دەسەڵات و شوێنەش لە دەستی پاپادایە، واتە پاپا لە سەرووی هەموو دەسەڵاتەکانەوە بووە. چونکە سەرۆکی کەنیسەی کاتۆلیکی بووە لە ڕۆژئاوادا، وەپاپا بۆ خۆی دەسەڵاتێکی باڵای هەبووە بۆ دەرکردنی یاسا تایبەتیەکانی کەنیسە، وەحاکمی بلندیش بووە لە جیهانی مەسیحی دا، ئەمە وێڕای ئەوەی کەوا سەرۆکی ئیداری و ڕۆحی کەنیسە مەسیحی (کاتۆلیکی)یش بووە[٥]، لەمەوە ئەوەمان بۆ دیار دەکەوێت کەوا جگە لە پاپا هیچ کەسێکی تر بۆی نەبووە دەست لە کاروباری کەنیسە وەربدات، وەئەو پلەو پایانەی کە لە پاش پاپاوە دەهاتن، بەهیچ شێوەیەك دەسەڵاتی ئەوەیان نەبووە کارێك بە بێ پرسی پاپا بکەن، یاخود دەتوانین بڵێین نەیاندەوێرا لەبڕیارو فەرمانەکانی دا دەربچن! وە هەر لەم پلە و پایە هەرەمییەدا ئەوە دەخوێنرێتەوە کەوا زۆری ئەو فەرمانبەرو خزمەت گوزارەی دەورووبەری کەنیسە، گوزارشت لەوە دەکات کەوا کەنیسەی مەسیحی لە ڕۆژئاوادا بە تەواوی جێگیر بووە و گەلێك قراوان بۆتەوە، وەخەڵکانێکی زۆریش پشتگیریان دەکات، ئەمە جگە لەوەی کەوا هیچ دەسەڵات وهێزێك لە ئارادا نەبووە هەتاوەکو ڕێگە لەم قەوارە نوێیە دابگرێت، وەدەشکرێت بلێین ئەم دەسەڵاتە دواجار لە سنووری ئایینی دا چوتەدەرێ، و خۆی خزاندوتە نێو بوارو لایەنەکانی تری ژیانی کۆمەڵگاوە. بۆ نمونە دەسەڵاتی کەنیسە ڕۆڵێکی گرنگی لە ڕەوتی گەشەکردن و بەرێوەچوونی ئەم بوارو لایەنانەی کە پەیوەست بوونە بە ژیانی کۆمەڵگای

ئەورووپای ڕۆژئاوا بە تایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاست دا. لەوانە جگە لەوەی کەوا بەرپرس و پارێزەری ئایینی مەسیحی ورۆڵی لە دانان ولابردنی فەرمانڕەوایی ناوچەییەکان وپاشا و تەنانەت ئیمپراتۆرەکانیش دا هەبووە، بەتایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاست دا، بەڵکو خاوەن چەندین هەزار پارچە زەوی وکێڵگەی کشتوکاڵی ولەوەڕگای ئاژەڵان و کۆمپانیا و دامەزراوەی ئایینی وئابووریش بووە، وەهەروەها بەرپرسی شێوازەکانی سەپاندن و کۆکردنەوەی باج بووە، وەبەرپرسی ڕاگەیاندنی شەڕیش بووە لە دژی ئەوانەی کە گاڵتەیان بە ئایینی مەسیحی و کەنیسە یان دەکرد یان لێیان هەڵدەگەڕانەوە[٦]، سەیر لەوەدایە کەنیسە بۆ خۆی باجییان نەدەدایە دەوڵەت وەملکەچی یاساکانیشی نەدەبوون، بەڵکو بۆخۆیان یاسا و دادگاکانی کەنیسەیان پێك دەهێنا، کەچارەسەری کێشەکانیانی دەکرد، وەهەروەها دەستیان بەسەر جڵەوی ئەو کاتەی خوێندنیش دا دەگرت[٧] وەچاوی دەبڕیە مەسەلەی ژن و ژن خوازی و بە جێماو وەسیەت، هەروەها فەرمانبەرانی کەنیسە سەرپەرشتی قوتابخانە و نەخۆشخانە و زانکۆکانیشیان دەکرد، وەدەبێت لە یادیشمان نەچێت خۆی لە لە کاروباری دەوڵەتی ئەورووپیش دا هەڵدەقووڕتاند[٨]، وەهەر لە چوار چێوەی باسەکەمان دا، پەلکێش دەکرێین بۆ ئەوەی کەوا باس لەوە بکەین، کەوا دەسەڵاتی کەنیسە ئەرکی ڕاکێشانی کۆمەڵانی خەڵکیان لە باوەڕهێنان بە ئایینی مەسیحی و فێرکردن و شیکردنەوەی ئینجیل و ڕێنماییەکانی ئەو ئایینەشیان لە ئەستۆ گرتبوو، هەروەها لەکاتی سەرپێچی خەڵکانی ئاسایی وخاوەن موڵك و گەورە بەرپرسان دەسەڵاتی سزادانیان هەبووە، ئەمە جیا لەوەی کەوا ئەرکی سەرپەرشتی کردن و چاودێریکردن و جێبەجێکردنی کاروبارە ئایینییەکانی کۆمەڵانی خەڵکیشیان لە ئەستۆ بووە، وەبەرپرسی چاپکردن و

ــوكردنــەوەی كتێبــە ئایینییــە كــانی تایبــەت بــە ئــایینی مەسیحی و كردنــەوەی خوێندنگاكانیان بوو[9].

ئەگەر لە ڕووی كۆمەڵایەتیشەوە بڕوانینە كەنیسە و پیاوانی لە و سـەردەمەدا، ـوهـا بۆمـان سـاغ دەبێتــەوە كــەوا لــەم بــوارەش دا ئەسـپی خۆیـان تـاوداوە، وەلەپێشی پێشەوەی زۆرینەی خـەڵكی بوونـە، وەهـەروەها خـاوەنی دەسـەڵات و ـوبانگی خۆیان بوونە. چونكە پیاوانی ئایینی (الاكلیروس) چینێكی باڵـاو نـاوازە بوونە،وەدابڕاو لە چینەكانی تری كۆمەڵگا بوونە لە كاتی سەدەكانی ناوەڕاست دا، وەك و باس دەكرێت میللەت دابەش دەكرا بەسـەر دوو بـەش، پیـاوانی ئـایینی لـە لایـەك و خـەڵكی تـریش لـە لایـەكی تـرەوە، ئـەم خەڵكـەش دەبوونـەوە بـە سـەر ـووكەرت، یەكەمییان (الاشراف) خانەدانەكان كەچینی دووەمییان پێك دەهێنـا لـە كۆمەڵگادا، وەدووەمییان چینی گشتی بوو كەوا بە چینی سێهەم ناودەبرا[10]، لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەم باسـەی سـەرەوەدا ئـەوەمان بـۆ دیـار دەكـەوێت كـەوا كەنیـسەی مەسیحی و پیاوانی لە ڕۆژئاوای ئەوروپادا، نەك هـەر جڵـەوی دەسـەڵاتی ئاینییـان گرتۆتە دەست، بە ڵكو دەكرێت بڵێین ژیان لەو سەردەمەدا لە ژێـر بـەزەیی ئـەوان دا بووە، واتە ئەوەی لەو ڕۆژگارەدا ژیاوە پەیوەندی بە ژیانی ڕۆژانەوە هـەبووبێت لەدەستی كەنیسەو پیاوانی كەنیسەدا بووە· جابۆیە لە سـەدەكانی ناوەڕاسـت دا، ژیانی ئەوروپیەكان بە دەوری تەوەری كەنیسە دا دەخولایـەوە[11]، سـەیر لەوەدایـە كەنیسەی مەسیحی (كاتۆلیكی ) وپیـاوانی سـەرەتا بـە دووی ئـەوەدا وێـڵ بـوون، ئاخۆ چۆن چۆنی ڕێگایان پێ بـدرێت بانگەوازەكـەیان فـراوان بكەنـەوە؟! كەچـی دواجار بانگەوازەكەیان تەشەنەی كرد و بڵاو بوویەوە، وەتوانییان جێگاو شـوێن و دەسەڵاتێكی باشی ئایینییان هەبێت لە و ڕوڕۆژگارەدا، كە چی بە هەموونەمانـەش

هێشتا قایل نەدەبوون ،هەتاوەك و جڵەوی تەواوی بوارو لایەنەكانی ژیانی ئەو كات و دەمە نەگرنە دەست .

ب/ كەنیسەی مەسیحی وپاوانكردنی بواری ڕۆشنبیری:

هەروەك و بۆمان بە دیار كەوت لە سەدەكانی ناوەڕاست دا، بەشێوەیەكی گشتی كەنیسەی مەسیحی دەستی بەسەر هەموو بوارەكانی ژیانی كۆمەڵگای ئەورویی دا گرتبوو، جابۆیە قۆرغ كردنی بواری زانست و ڕۆشنبیریش بەدەرنەبووە لەو فشارو تەگەرانەی كەوا كراوەتە سەری، و لە چەندین شوێن و كاتی جیاجیادا بووە بە مایەی كۆسپ وبەربەست لە بەردەم ڕەوتی گەشەكرنی پێشكەوتنی ڕۆشنبیری دا، بەڵام وێڕای ئەمەش تا ڕادەیەكی باش ڕۆشنبیران بە شێوەیەكی گشتی توانیوویانە ڕۆڵی خۆیان بە باشی بگێڕن .

لە سەدەكانی چوارو پێنج و شەشی زاییندا، سەردەمێكی گرنگی گواستنەوە بوو لە ژیانی فیكری ئەوروپای ڕۆژئاوادا، كە ئەدەبی مەسیحی جێگەی ئەدەبی كلاسیكی واتە ئەدەبی یۆنانی وڕۆمانی گرتەوە، وە خوێندنیش هەر لە خزمەتی ئامانجەكانی كەنیسەدا كوورت كرابوویەوە[١٢]، واتە دەتوانین بڵێین ئەو زانست و زانیارییانەی كە هەش بووە هەر لە چوارچێوەی هزرو بیردكرنەوەی كەنیسەی مەسیحی بووە، وەلە هەمان كاتیش دا بەرهەمی ئەم زانستانەش زۆربەی زۆری لە خزمەت ی كەنیسە و پیاوانیدا بووە. كەواتە كەنیسەی مەسیحی بەدرێژایی هەزار ساڵ بزوتنەوەی پێشكەوتنی زانستی وەستاندبوو، چونكە ڕۆشنبیری هەمووی قۆرەخ كرابوو لەنێو دەستی دا[١٣]، وەهەر لەو كاتەی كەوا كەنیسەی مەسیحی دەستی بەسەر هەموو لایەنەكانی ژیاندا دەرۆیشت، ڕۆشنبیری لە نزمترین پلەدا بووە، چونكە كەنیسە پێشكەوتنی ڕۆشنبیری و زانستی بە مەترسییەك دەبینی بۆ

دەسەڵاتنەکەی خۆی[14] چونکە پێ یان وابووە عەقڵ و زانست مرۆڤ لە گرنگییە تاك وبنەڕەتییەکەی لادەدات، کەداوای لێ کراوە لەسەر ئەم زەوییەدا، ئەویش دڵنیایی ڕزگاربوونیەتی لە (الدار الآخرە)[15] بۆیە لەو سەردەمەدا زۆرینەی کات هەوڵیان دەدا کەوا لە مرۆڤ بکەن نەك هەر لە زانست دوور بکەوێتەوە، بەڵکو هەوڵی ئەوەیان لە گەڵ دەدا کەوا ئەم ژیانە لایان بێ ماناو پوچ بکەن، وەزۆر جاریش مرۆڤەکانییان دەترساند بە سزادانی خوداوەند لە ڕۆژی دوایی کە پاش چاوەڕێییەتی. ئەوەتا لە سەدەی سیازدەدا یەکێك لە بانگەشە کەرانی مەسیحییەکان دەڵێت: ((ڕێژەی دەرچوونی ڕۆژی دوایی یەکێك تێناپەڕێنێت لە هەموو سەد هەزار کەسێك دا))، واتە دە لە ملیۆنە، و ئەوانەش کە ماونەتەوە چارەنووسیان لە ئاگردایەو (بئس المصیر)[16] ئەم جۆرە فەتواو بانگەشەیە وئەو تۆقاندن و دەستەمۆیە، ئەوەی لێ دەخوێندرێتەوە کەوا مەبەستییانە مرۆڤەکان ملکەچی خۆیان بکەن، کەبەنێوی ئایینەوە هەموو کۆمەڵگایان خستبووە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. چونکە دام ودەزگاکانی کەنیسەی مەسیحی سەدەکانی ناوەڕاست توانییان ئایین بکەن بەشێوەیەك لە شێوەکانی ئایدۆلۆجی دونیاویی، ئەمەش ماوەیەکی زۆر بە دەسەڵاتداری مایەوە، وە بوو بە کۆسپ لەبەردەم گەشە کردن و پەرەسەندنی زانینی مرۆڤایەتی[17]، لێرەدا دەبێت بزانین کەوا دەسەڵاتی کەنیسەی مەسیحی بە تەواوی کۆنترۆڵی بواری ڕۆشنبیری کردووە بە هەموو لق وبەشەکانییەوە. بۆنموونە پرۆسەی خوێندن و زمانی لاتینی پاوان کرابوو، وە پیاوانی ئایینی بۆ خۆیان بوونە توێژی خوێندەوارو ڕۆشنبیری سەدەکانی ناوەڕاست، وەهەخۆیان بوونە خوێنەرو ڕاڤەکەری کتێبی پیرۆز[18]، تاوەك و جەماوەر نەیخوێنێتەوە لە ترسی ئەوەی نەك بە جۆرێکی وەها لە ئایەتەکانی

تێبگات کە لە گەڵ ڕەوشت و کردەوەی هەندێك پیاوانی کەنیسەدا ڕێك نەکەوێت و ڕەوشتیان پێچەوانەی ئایەتەکانییەوە بێت[19]، وەدەبێت لە بیریشمان نەچێت زوبانی لاتینی کەنیسە، چەند سەدەیەك بووە تاکە زمانی ڕۆشنبیری[20]، ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت ئەوەیە کەنیسەی مەسیحی لە ڕێگەی ئایینەوە ویستوویەتی دەسەڵاتی بەسەر هەموو بوارەکانی ژیان دا بشکێ، وە هەر کەنیسە خاوەن دەسەڵاتی باڵا بێت، وە هەربابەتێکیش کە ناکۆك و ناتەبا بێت لە گەڵ بیروباوەڕەکانی کەنیسەی مەسیحی وپیاوانی ئەوە کەنیسە بە لادەرو قەدەغەکراوی لە قەڵەم دەدات، ئەگەر وانەبێت، دەنا کەنیسە چ کارێکی بەبوارەکانی تری ژیانی کۆمەڵگاوە هەیە؟! بۆنموونە زانستی پزیشکی قەدەغە کرابوو هەروەك و هەموو زانستەکانی تر، کە بە دڵی کەنیسە نەبووە، بەڵام چاککردنەوە وپزیشکی بۆچینی گەورەو سەردارەکان تەرخان کرابوو[21]، هەروەها هەتا وەکو سەدەی دەیەمی زایینیش دا دێرەکان شوێنی سەرەکی فێربوون بوونە بەڵام کەنیسەکان قوتابخانەکانی دروست کرد و کردنیە پاشکۆیی خۆی، وەهەر ئەم قوتابخانانەش ڕکابەری دێرەکانی دەکرد و خێرا بەسەریدا سەرکەوت[22]، لە ڕاستیدا لێرەدا ئەوەمان بۆ بەدیاردەکەوێت کەوا بواری ڕۆشنبیریش کەوتبووە ژێر کاریگەری کەنیسەی مەسیحی، واتە ڕۆشنبیری لە کەنیسە و هزرو دەگەڕێت، بێ گوومان لە کەنیسەدا نادۆزرێتەوە، چونکی پیاوانی کەنیسە ئەو ئایینەیان کردبووە دارە دەستی خۆیان وەبۆ خزمەتی کۆمەڵگەیان بەکارنەدەهێنا، بەڵکو بۆ بەرژەوەندی و مەرامی تایبەتی خۆیان بووە، جا بۆیە تێبینی دەکەین ئەو کەسانەی کەوا سوورن لە سەر زانست و ڕۆشنبیری فراوان و بیروباوەڕی خۆیان وهەڵوێستیان ، دواجار دەبێتە جێی ناکۆکی کەنیسە و پیاوانی، چونکە دوو ڕێباز

بۆچوونی جیاواز لەیەکتر سەرهەڵدەدات. جا ئەم جۆرە ناکۆکی وململانێیەی کە لەنێوان کەنیسەی مەسیحی وئەو کەسانەی کە خاوەن بیروبیرکردنەوەی تایبەتی خۆیان بوون و عەودالّی مەعریفە بوونە بە درێژایی ماوەیەکی زۆر ڕەنگدانەوەی هەبووە لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا، ناکۆکییەکەش بە شێوەیەکی گشتی لە گەڵ بواری ڕۆشنبیری دا بووە و بەتایبەتی لە گەڵ بیرو بۆچوونی فەیلەسووفان، وە کەنیسەی مەسیحیش بۆ خۆی بە تاکە هێزو دەسەڵاتی ڕەها دەزانی وپیاوانی ئایینیش ترسی ئەوەیان هەبوو کەوا بیرمەندان و فەیلەسووفان کارێکی وەها نەکەن کەوا پەردە لە سەر کاروباری کەنیسە وپیاوانی وخراپەکارییە کانی دا هەڵبدەنەوە، وەدەسەڵاتییان لاواز بکەن وەلە لایەکی تریش چەندین کەسایەتی دیارو بەتواناو هزرڤان دەرکەوتن بە بیرو باوەڕەکانی کەنیسە قایل نەدەبوون، واتە خودی ئەم کێشەیەش زیاتر لە نێوان فەلسەفە و ئایین دا بوو. هەروەکو ئاشکرایە فەلسەفە پشت بە ئەقل دەبەستێ ومەسیحییەتیش لە سەر سروش (وحی) دەوەستێ، جا لەماوەی ئەو چەند سەدەیەدا فیکری سەدەکانی ناوەڕاست هەوڵی دەدا کەوا فەلسەفەی یۆنانی وفێربوون وباوەڕەکانی مەسیحی تەبا بکات، هەرچەندە لەو پێناوەدا زۆر گفتوگۆ و توێژکردن درا بەڵام سەرکەوتن تێیدالاواز بوو[23] وەتەواوی کارە فەلسەفییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست لە سەردەستی (سکۆلارتییەکان)دا لە سەدەی نۆیەم بە دواوە دەرکەوت، ئەویش لە پێناو گونجاندنی ئایینی مەسیحی بووە لەگەڵ فیکری فەلسەفی، وەلە کۆتایی سەدەی سیازدەدا بەهەوڵەکانی (تۆماسی ئەکینوس) بۆ گونجاندنی فیکری ئەرستۆتالیس و ئایینی نێوبراو گەیشتە لووتکە[24]، بەڵام دەبێت لە یادمان نەچێت لە سەدەکانی یازدەو دوازدەی زاینیدا بەرهەمەکانی ئەرستۆ لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا

ناسران، لە ڕاستی دا لای بیرمەندان ئەوەندەی لێك گرێدانی ئەفلاتوون بە بیری مەسیحییەوە ئاسان دەینواند ،لێك گرێدانی ئە ڕستۆ ئاسان نەیدەنواند[25]، یەکێکی وەکو (روجەربەیگون ١٢١٤-١٢٩٤ز) قەشە وڕۆشنبیریش بوو، وێڕای ئەوەی عەقڵی تێوره غەیبە سەرومرەکانی نەدەبرد و بڕوای پێنەدەکرد، بەڵکو یەکەم کەسیش بووە دەرگای گفتوگۆی دایلێکتکی لە ناو ڕۆژئاوادا کردەوە، وەدوای چوارده ساڵ لە بەندیخانەی ئۆکسفۆرد بە سەر برد و دواتر مرد[26]. هەوڵ و تەقەلای ڕۆشنبیران وای لە کەنیسە ودەسەڵاتی کەنیسەی کرد کەوا زیاتر بە خۆیان دا بچنەوە و زیاتر ترسیان لە لا دروست بێت. چونکە نابێت بە لامانەوە سەیر بێت کەوا لە سەدەی سیازدەدا خوێندنەوەی کتێب و دەقە پیرۆزەکان بێ ئاگاداری ومۆڵەتی کەنیسە و پیاوەکانی قەدەغە کرابوو[27]، یاخود گوێ بیستی فەتواکەی قەشە (ستیڤان تێمپیر) بین لە ساڵی (١٢٧٧ز)دا ، فەتوای قەدەغەکردنی فەلسەفەی داوە، وە بە نووسین بڵاویکردۆتەوە، ئەم فەتوایە لە زانکۆی پاریس و کۆلێجەکانی ئۆکسفۆرد و سەرانسەری ئەوسای ئەورووپادا جێبەجێ کراوە، وە فەیلەسوف وبیرمەندەکان دووچاری نان بڕان و سەرگەردانی و ڕاوەدوونان هاتوون، وەلە چەند خاڵێکی فەتواکەدا ووتراوە، کەنیسە وڕاپەڕانی دەزگاکانی ئایین وایان داناوە فەلسەفە هەڕەشە لە ئایین دەکات[28]، لە بەر ڕۆشنایی ئەم باسەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کەوا لە میانەی ئەو ململانێ و ناکۆکییەی کە لە نێوان فیکر و فەلسەفە و ئایینی مەسیحی دا هەبووە، وە ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی دراوە بۆ تێگەیشتن وتەبایی نێوانیان سەرنەکەوتووە، چونکە ڕێباز و پەیڕەوی جیاواز لە یەکتریان هەبووە، ئەمە جگە لەوەی کەوا بووە بە مەترسییەکی بەرچاو بۆ کەنیسەی مەسیحی، وەلای خۆیشی دا سزاو ئەشکەنجەی

بۆ ئەو کەسانە دانابوو کەبیروباوەڕێکی وەها بخەنەڕوو کە لەگەڵ بیرو بۆچوونە کانی کەنیسەدا نەگونجێ!. سەرسوڕمان لەوەدایە ئاخۆ کەنیسە بۆچی ـەهاتنەکایەی فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست دەترسێت و هەوڵی ئەوە دەدات قەدەغەی بکات و نەهێڵێ سەروەدەر بنێت؟ ئەگەر بۆ مەرام وبەرژەوەندی خۆی نەبێت! چونکە ئەوەتا (ڕێنێ دیکارات )ی فەرەنسی پێمان دەڵێ: (بەهرەیەك کە خودا بە وولاتێکی بدات ئەوەیە فەیلەسوفی ڕاستەقینەی پێ ببەخشێ)[29] جێی خۆیەتی لێرەدا نموونەی (ئەلیجینسەکان)و (الژیەکان) بهێنینەوە، وەك و دوو نموونەی هەرە دیارو کاریگەری ئەو هەوڵە ڕادیکاڵییانەی کەوا لە کۆتایی سەدەی دوازدە وە بەجۆرێك بوونە مایەی مەترسی لای کەنیسە کەوا لە سەرەتای سەدەی سێزدە لە لایەن پاپا (ئیتوسنتی سێیەم) دا بانگەشەی لە شکرکێشی خاچی بۆ لە ناو بردن و بنەبڕکردنییان کرا، گروپی یەکەم لە سەدەی یازدەوە لە ناوچەکانی باشووری فەرەنسادا دەرکەوتن و بانگەشەی ژیانی هەژارییان دەکرد و ڕەخنەیان لە زۆرێك لە پەیڕەوەکانی کەنیسەی کاتۆلیکی دە گرت، وەك و پەرەستنی سانتەکان و حەوت نهێنییەکان، پەیڕەوێکی ئایینی تایبەتییان هەبووە، گروپی دووەمیش لە هەمان شوێن لە سەر دەستی (پیتەروالدۆ) سەریان هەڵداوە، ناوبراوو باوەڕی وابووە دەبێت تاکی مەسیحی بگەڕێتەوە سەر شێوازی ژیانی سەردەمی نێردراوەکان، هەربۆیە سەروەت وسامانەکەی بەسەر لایەنگرەکانیدا دابەش کرد[30].

بشێ کەنیسە و پیاوەکانی بەم هەموو کرداره نامرۆییانەی کە بەرامبەر بە ڕەوتی زانست و مەعریفەدا دەیکەن، ڕوحی تۆڵە سەندنەوەیان لە ناخدا چێندرابێت وە لەوێندەرەوە سەرچاوەی گرتبێ، چونکێ ئەمانیش سەردەمانێك دەچەوسێنرانەوە و ستەمییان لێ دەکرا, وە بۆ دواجاریش هێندە کۆمەڵگا

پابەندی پـەیڕەوەکانی ئایینەکـە بوونـە، هێنـدە کەنیـسەو پیـاوانی بەپـەرۆش نەبوونە، جابۆ ئەم مەبەستەو بەهۆی ئەم ناکۆکییـەی نێـوان فەلـسەفە و ئـایین دا هـەبووە، وەلـە لایـەکی تـریش بـەهۆی بیروبۆچـوونی جیـاوازەوە کـە لـە لایـەن بیرمەندان و فەیلەسووفانەوە سەرچاوەی گرتبوو ،وای لە کەنیسە و خزمـەتکارانی کرد کە تەنگیان پـێ هـەڵبچنن. جـا بۆیـە هـەر لـە سـەرەتای سـەدەی سـیازدەوە ((دادگاکانی پشکنین)) دامەزرا[٣١]، وەمێژوونووس (الیوسف) لە وپەرتووکەیدا بـاس لەوە دەکات کەوا پاپا ( گریگۆری) نۆیـەم ( ١٢٢٧-١٢٤١ن) بـە بەرپرسـی فـەرمی دادەنرێت لە دۆزینەوەی دادگاکـانی پـشکنین[٣٢]، ڕەنگبێ نووسـەر لـەم باسـەی دا مەبەستی ئەوە بووبێت کەوا دادگاکانی پشکنین لە ماوەی پاپا گریگۆری نۆیـەم دا دامەزراوە، وەهەر پاپا بۆ خۆی بەرپرسیارە کە ئایا ئەم جۆرە جموجۆڵەیان بـاش بووە یاخود خراپ، نەك هەر ئەمە بەڵکو هەر دیاردەیەکی تـر لـەم ماوەیـەدا ڕووی دابێت ئەوە دەکەوێتە ئەستۆی پاپای نێـوبراوەوە، چـونکە لـەو ماوەیـەدا خـاوەن دەسەڵات وفەرمانڕەوا بوو. ئەوەتا لە سـاڵی(١٢٣٣ن) ڕۆژگـاری پاپـای نێـو بـراوو، بڕیار دراوە بە سەر جەم کەنیسەکان، بۆ دیاری کردنی پیاوێکی ئایینی تایبەت بـە لێکۆڵینەوە لە گوومان لێکراوان وەلە لایەن تۆڕێکی سیخوڕییەوە یارمـەتی دەدران ،ئەم سیخوڕانە لە هەموو تاوان و گوناهێك دەست واڵا دەکران [٣٣]، وەهەروەها پاپا (انوسـنت ) ی سـێهەم توونـد بـووە لـە کـاری هەڵگـەڕاوەکان وە دەی گـووت: (( یاسای مەدەنی سزای خائینەکان دەدات بە دە ست بە سەرا گرتنی موڵکەکانیان و مردنیشیان دا، ئایا ئێمە هەقی ئەوەمان نی یە ڕێگە بدەین بە دەرکردنی سـزادانی بـێ بەشـکردن و دەسـت بەسـەرا گـرتنی موڵکـەکانی خائینـەکانی ئـایین؟ دەسـتدرێژیکردنە سـەر قەدەغـەکراوەکانی ئـایین گـەورەترە لـە تـاوانی

ـمـستدرێژیكردنە سـەر خـاوەنی سـوڵتان))[٢٤] ، لـە ئەمـەوە ئـەوەمان بـۆ دیـار
ـەكەوێت كـەوا جگـە لـەوەی پاپـا دەسـەڵاتی خـۆی زۆر بـە گـەورەتر زانیـوە لـە
ـمـەڵاتی مەدەنی و حكومی ، بەڵكو دەیهەوێت بڵێیت ئەگەر تاوانێك كە خائینێـك
ـێكـات بەرامبەر بە دەسەڵاتی دونیایی وە پاداشـتی سـزای خـۆی وەربگرێـت، ئـەو
ـسـز و ئەشـكەنجەو ئـازارە لـە لایـەن كەنیـسە و پیاوەكـانی بەرامبـەر بـە جـۆرە
ـێـرنكی وەها لەوەش پێشترە،واتە زیاتر لـەم ووتەیـەوە دەیـەوێت مـافێكی پـتر
ـەرعی ومەدەنیش وەربگرێت . جائەم دادگایە بە پشتیوانی دەسـەڵاتی دونیـاوی
ـووە، ئەویش بۆ ڕاوەدوونانی ئەو كەسانەی گومانی ئەوەیان لێدەكرا كـە دژ بـە
كەنیسە دەوەستن و بە نامرۆڤانە ترین شـێوە كەوتنـە وێـزەی ئـەو كەسـانەی كـە
ـكـە ووشـەیەكییان دژی كەنیـسە بدركاندایـە[٣٥]، وە ئـەو كەسـانەی كـە ئـازاری
خەڵكیان دەدا دەستەیەكی نەزان ونەفام وچاو برسی بوون، جاریواش هـەبوو ئـەو
ئـازار دانانە چەند ساڵێكی دەخایاند، بۆ وێنە زانای گەورە (جۆردانۆ برۆنۆ) هەشت
ـساڵی ڕەبەق ئەو ئازارەی چەشت[٣٦]، وەدەبێت لـە یادیـشمان نەچـێت هـەموو ئـەم
كردارانە بە هۆی تێرامان و تێڕوانینی جیاوازەوە بووە ،وەبووە هۆی مەترسییەكی
ناوەخۆیی، جابۆیە كەنیسە بـە تـەواوی دەسـتی نـابووە بینـە قاقـای هـەموو ئـەو
كەسانەی كـە گومـانی خراپیـان لـێ دەكرێـت لـە لایـەن كەنیـسەوە ، وەبـۆ ئـەم
مەبەستەش پیاو وئامێری تایبەتی هەبووە لە بۆ سزادان، ئیدی لە ئاگر سـووتاندن
بێت یاخود زیندانی هەتا هـەتایی یـان مـردن بێـت. جابۆیـە نابێـت سـەیر بێـت بـە
لامانەوە كە گوێ بیستی ئەوە بین كە لە ماوەی نزیكەی دوو سەدەدا دەیان هەزار
كەسیان لە ئاگردا سوتاند و بە زینـدانی هەمیـشەیی سـزایاندان[٣٧]، بـەڵكو سـەیر و
سەرسوڕمان لەوەدایە كەوا بە پی ی بڕیـارێكی تایبـەتی دادگاكـانی پـشكنین مـاف

سزادانی مردووانیشیان وەرگرت[٣٨]، هەموو ئەمانە لە پای ئەوەی کەوا کەنیسەو پیاوەکانی بە هیچ تێڕامان و بیرکردنەوەیەك قایل نەدەبوون کەوا جیاواز بێت لە گەڵ بۆچوونەکانی خۆیاندا، چونکە مەترسییان لە قەڵەم دەدا بوڵاواز کردنی دەسەڵاتەکەیان، هەر بۆیە ئەم هەموو قوربانییەو کاولکارییەی لێکەوتەوە. وەلە سەرەتای سەدەی چواردەدا لە سەر دەستی ( ولیام ئۆکهامی) کۆتایی هات بەوەی تەواوی بوارەکانی فیکری وئایینی جودا بکرێتەوە[٣٩]، بەڵام دەبێت بزانین لەم قۆناغە بەدواوە ئیدی بارودۆخەکە تاڕادەیەکی باش ڕووی لە گۆڕان کردووە، چونکە خەباتی بیرمەندان ونووسەران و فەیلەسووفان بڵاو بوویەوە، وەخەڵکانێکی زۆر کەوتنە ژێر کاریگەری بیروبۆچوونەکانییان، کەوا گەندەڵییەکانی کەنیسەیان بە دیار دەخست، وەدەتوانین بڵێین لە م قۆناغەدا زانکۆکانیش ڕۆڵی باش وکارایان بینیوە، وەبیروباوەڕە فەلسەفیەکانیش لەولاوە لە خەبات و خزمەتی خۆیان بەردەوام بوون ،جابۆیە کەنیسە ڕووی لە لاوازی و بێ هێزی دەکات ، ڕاستە فەلسەفە و بیرو بۆچوونەکانی بەرامبەر بە کەنیسە وئەو ناکۆکی ودووبەرەکی و قوربانی دانە، نەیتوانی چارەسەرێکی بنەڕەتی ئەو کێشەیە بکات ومەسەلەکە بخات بە لایەك دا ،کە کەنیسە بەسەر کۆمەڵگای ئەوروپی دا هێنابووی، بەڵام لە گەڵ بوونی ئەمەش دا ڕۆڵێکی باشی گێڕا لەو قۆناغ و جێگایەدا، وەهەنگاوی بەرەو پێشەوە نا. وەلەم باریەشەوە دوور ناکەوینەوە لە ڕاستی ئەگەر بڵێین ( فرە دریك ئینگلێز) زۆرباشی بۆ چووە کە دە ڵێت: ((ئەگەر داوا لەفەلسەفە بکرێ هەموو کێشەکانی ژیان و کۆمەڵ چارەسەر بکات و بەلایەکیاندا بخات، ئەو داواکاریە وەك ئەوە وایە داوا لە مرۆڤێك بکەین خەمی هەموو دنیا بخاتە ئەستۆی خۆی))[٤٠]، هەرچەندە فەلسەفەش لە زۆر ڕووەوە ناکۆك بووە، لە گەڵ کەنیسەوە

سووریش بووە لە سەر بیروباوەڕەکانی خۆی وەلە زۆر کات و شوێن دا هێرشی زۆر توند کراوەتە سەر کەنیسە و پیاوانی ،کەئەمەیش کەنیسەی توڕە دەکرد ،چونکە لایان وابوو لە پیرۆزییەکان دەدرێت ، بە هەر حاڵ دواجار فەلسەفە و زانست وبواری ڕۆشنبیری کە کۆمەڵێك کەسی بە توانا خەباتییان بۆی دەکرد و گرتبوویانە ئەستۆی خۆیان ،توانییان گورزێکی باش لە بیروباوەڕەکانی کەنیسە بدەن، کە ئەمەش بە قازانجی کۆمەڵگادا شکایەوە.

(ج) دەرەبەگایەتی و ڕەنگدانەوەی بە نێو کۆمەڵگای ئەورووپی دا :

لە ڕاستیدا پوختەی باس کردنی پرسی دەرەبەگایەتی لە سەدەکانی ناوەڕاست و لە مێژووی ئەورووپای ڕۆژئاوادا گەلێك گرنگی هەیە، چونکە جگە لەوەی کەوا دەسەڵاتێکی دیار وبەرچاوی هەبووە لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست دا ،بەڵکو بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە ئەورووپادا تەمەنی خۆی بەسەر بردووە ، وەئەوەندە ڕەنگدانەوەوکاریگەری هەبووە لە نێو کومەڵگەدا ،گەیشتۆتە ئەو ئاستەی هەروەك و لە مەو پێش باسمان کرد ، لای هەندێك لە مێژوو نووسان دا سەدەکانی ناوەڕاست بە سەردەم وقۆناغی دەرەبەگایەتی ناوەزەد دەکرێ، واتا باڵا دەستی وهەژموون وسەروەری دەرەبەگایەتی لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژووی ئەورووپادا بابەتێکی گرنگ و حاشا هەڵنەگرە ،وەدەبێت ئەوەش بگوترێ ئەم دیاردەیە زیاتر وەك و دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی وئابووری خۆی نیشان داوە لە نێو کۆمەڵگەی ئەورووپی دا ، وەناشکرێ یاخود ناتوانرێت مێژووەکەی بەتەواوی ودروست دەست نیشان بکرێت ،وەهاو کات چەندین هۆکارو فاکتەر لە ئارادا بووە بۆ یارمەتی دان و لە دایك بوونی ئەم جۆرە سیستەمە کە هەرگیزاو هەرگیز مێژووی مرۆڤایەتی لە یادی ناکات، هەر بەهەمان شێوەش چەندین فاکتەر هەبووە بۆ لاواز بوون و ڕووخانی.

هـــەروەك و ئاماژەمـــان پێكـــرد ، مێـــژووی ســـەرهەڵدانی سیـــستەمی دەرەبەگایەتی لە ڕۆژئاوای ئەوروپادا، مێژوویـەكی دیـاریكراوی نـی یـە ، بـەڵام لـە گەڵ ئەمەش دا چەندین ڕا و بۆچوونی جودا جودا هەیە لەم بارەیەوە ، هـەر ئـەم بۆ چوونانەش وامـان لـی دەكـات كـە دەسـتە ودامێن دانەنیشین و بەشێوەیەكی گشتی مـاوەی تەمـەنی دەسـت نیـشان بكـرێ. لەوانـە هەنـدێك كـەس لایـان وایـە سیـستەمی دەرەبەگایـەتی ( فیـودالی ) لـە سـەدەی ( نۆیـەم )و(دەیـەم ) دا لـە ئـەوروپای ڕۆژئـاوادا ناسـراوە[41] ، بـەڵام مێـژوو نوسـێكی وەك و ((مقرحـی)) مێژووەكەی دەگەڕێنێتەوە بۆ سـەرەتای سـەدەكانی ناوەڕاسـت، وەبـاس لـەوەش دەكات كەوا لە م ماوەیەدا بە شێوەیەكی كـرداری دەسـتی پێكـردووەو بـەردەوام بووە هەتاوەك و سەدەی سیازدە[42] ، وەهەروەها لە هەنـدێك سەرچـاوەدا هـاتووە، كـەوا لـە سـەدەی (دە) و( یـازدە) لـە زۆربـەی شـارەكانی ئـە ورو بـای ڕۆژئـاوادا دەرەبەگایەتی گەیشتۆتە قۆناغی پێگەیشتن[43]، كـە چـی لـە هەنـدێ شـوێنی تـردا باس لەوە كراوە كەوا لەماوەی نێوان سەدەی یازدەو دوازدە دا گەیشتۆتە قۆناغی پێگەیـشتن[44]، بـەڵام لـە گـەڵ بـوونی هـەموو ئەمانـەش ، ناونـانی دەرەبەگایـەتی هەتاوەك و كۆتایی سەدەی هەژدەهەم بڵاونەبووەتەوە[45]، لێرەدا دەبێت لە یادمان نەچێت ڕاستە بشێ نـاو وزاراوە كـەی هـەتاوەك و ئـەو دەمـە بڵـاو نەبووبێتـەوە ، بـەڵام ئـەم سیـستەمە وەك و دیاردەیـەكی كۆمەڵایـەتی و ئـابووری ، لـە مێـژەوە ڕەنگدانەوەو كاریگەری خۆی بەسەر كۆمەڵگەدا بـەجێ هێشتووە. چـونكە ئەگـەر ئاوڕێكی خێرا بدەینەوە زیاتر مەبەستەكەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، لەسەدەی چوارو پێنج ی زایینی دا لە ئەوروپا ژمارەی كۆیلەكان كەم بوویەوە ، وەچینی (الكولـون) بـووە چـینی ســەرەكی بەرهــەم هــێن، كۆلۆنــەكان كرێكــار بــوون و بــەزەوی

بەسترابوونەوەو کاریان تێدا دەکرد بەرانبەر ئەوەی بەشێك لە بەرهەمیان بەدەست بکەوێت[٤٦]، لە پاش ئەم ماوەیەدا بەرەبەرە دەرەبەگایەتی سەرهەڵدەدات کەبەپاڵ پشتی چەند فاکتەرێك جێگەی خۆی دەکاتەوە، ئەم دەرەبەگانە دەبن بە خاوەنی ئەم کرێکارو جووتیارانە، وە کرێکارەکانیش لەهەمان کاتدا دەبن بە بەرهەم هێنێکی زۆر باش وسەرەکی بۆ دەرەبەگایەتی لە ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاست. جابۆیە سەدەکانی ناوەڕاست بەسەروەری دەرەبەگایەتی هەژمار دەکرێت، وەلە هەموو لایەنەکانی ژیانی ئابووری وڕامیاری وهزری دا، وەك و دیاردەیەکی مێژوویی وکۆمەڵایەتی وسیاسی ناکرێت بە مێژوویەکی دیاریکراو دەست نیشان بکرێ[٤٧]، بەڵام دەکرێت بڵێین وەکو بەشێك لە مێژووی ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاست، سەردەمی دەرەبەگایەتی لە ڕۆژئاوای ئەوروپادا مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست وەلەم کاتەوە کاریگەری و ڕەنگدانەوەی لە سەر کۆمەڵگەدا دەبێت هەتاوەك و کۆتایی سەدەکانی نێو براوو وگەیشتن بەو کۆمە لە گۆڕانکارییە هەمە جۆرە، وەك و دەرکەوتنی چینی پڕ جوازی کەوا گەورەترین ڕۆڵی گێڕاوە بۆ ڕووخان و لەنێو چوونی سیستەمی دەرەبەگایەتی. دەبێت لە یادمان نەچێت نەك هەر لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا، بەڵکو لە تەواوی شوێن وجێگاکانی دونیا بۆ هاتنە کایەی جۆرە سیستەمێکی وەهاوە، پێویستە کۆمەڵێك هۆکار پاڵی پێوە نابێت هەتاوەك و سەر هەڵبدات و گەش ونما بکات. لەوانە مێژوو نووس (جفری بروَن) لە پەرتووکەکەی خۆی دا، باسی لەوە کردووە کەوا مێژوو نووسان لە سەر ئەوە یەکدەنگن کە دەرەبەگ لە ئەنجامی دارمانی دەسەڵاتی مەرکەزییەوە دەرکەوتووە[٤٨]، وەهەروەها لاوازی وبێ هێزی پاشاکان لە پاسەوانی کردنی مەمالیکەکانیان دا، هۆیەك بووە بۆ دەرکەوتنی دەرەبەگایەتی[٤٩]، وەنابێت

باسکردنی پیاوە ئاینییەکانیشمان لە یاد بچێت ،چونکە پیاوانی کەنیسەش بە دوور نەبوونە لە سیستەمی نێوبراودا، بەڵکو وێڕای ئەوەی سەرۆکی ئاینیان دەکرد ،وەسەروەرێتی دەرەبەگەکانیش بوونە ، وەخودی پاپاش گەورەی دەرەبەگایەتی بووە[50] ، ئەمە جیالەوەی کەوا کەنیسەش یارمەتی ڕووخانی دەسەڵاتی حکومەتی داوە ،بە بەهێزکردنی سیستەمی دەرەبەگایەتی وەچوونە ناوەوەی دا[51] ، وێڕای هەموو ئەمانەش (الیوسف) باس لەوە دەکات کە وا لە ئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی دەسەڵاتی ناوەندییەوە، پێویست نەبووە دەرەبەگایەتی بێت[52] ، جگە لەمانەش چەند فاکتەرێکی تریش هەبووە بۆ یارمەتی دانی دەرەبەگایەتی ٠لەوانەش شەڕی خاچ دروشمەکان، ئەم بزوتنەوەیە یەکێك لەو هێزە گەورانە بووە کەوا مێژووی ڕۆژئاوای ئەوروپای جوڵاند ،وەهەروەها لەماوەی ساڵانی ( ١٠٩٥–١٤٠٠ز) لە ڕۆژئاوای ئەوروپادا مایەوەو حوکمی بەهزرو هەستەکانییانی دەکرد[53] ، وەبەشێوەیەکی گشتی نزیکەی دوو سەدە بەردەوام بووە[54] ، بەڵام لە سەرووی هەموو ئەم فاکتەرانەوە، دەکرێت لاواز بوون و ڕووخانی دەسەلاتی ناوەندی بە گەورەترین و کاریگەرترین هۆکار دابنرێت، چونکە ڕۆڵێکی باشی گێڕاوە بۆ لە دایك بوونی سیستەمی نێو براوو، هەروەك و بۆمان ڕوون بوویەوە لە سەدەکانی ناوەڕاست دا ناکۆکییەکی توندو تیژ ودرێژ خایان هەبوو لە نێوان پیاوەکانی ئاینی و پیاوانی دەسەڵاتی زەمەنی، جا لە کاتێك دا کەوا کەنیسە وپیاوانی پشتگیری خۆیان بۆ دەرەبەگایەتی دووپات دەکەنەوە ،وە لەو لاشەوە دەسەڵاتی ناوەندی لاواز ونەخۆش کەوتووە، ئەمە دەبێتە وەهەل و مەرجێکی گونجاوو ولەبار بۆ ئەو کاتەی کەوا سیستەمی دەرەبەگایەتی بێتە کایەوە ،ڕاستە ڕەنگە پێویستی کۆمەڵگە لەو کاتەدا بەوەنەبووە هەتاوەك و

دەرەبەگایەتی ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە، بەڵام دواجار توانی جیّ ی خۆی بکاتەوە· جالێرەدا جیّ ی خۆیەتی تۆزێك لە مەڕ ئەو خاڵەدا بوەستین کائاخۆ کەنیسە و پیاوانی بە چ جۆریك پشتگیریان لە دەرەبەگایەتی کردووە، وە چۆن بوونە بە فاکتەرێکی گرنگ و بەرچاو بۆ هاتنە کایەی ئەم جۆرە سیستەمە بە نێو کۆمەڵگەی ئەوروپی دا. کەنیسە دوای ئەوەی لە رێی بەخشیش و سەدەقەو لێبوردن و دانی تەواوی باجە دونیاییەکان ، بوو بە خاوەن گەورەترین سەروەت و سامان ،وەسیّ یەکی باشترین زەوی زاری ئەوروپای کەوتە دەست،لە وساوە بۆ خۆی بووە گەورەترین دەرەبەگ ،وەپارێزەری ئەو بارودۆخەو لەم پێناوەش دا بووە پێکهێنەری بنەما فیکری سیستەمی دەرەبەگایەتی وبە جۆرێك پرەنسیپەکانی دادەتاشی کە بتوانێت خزمەت بە رەوشی باوو بکات ، بە جەختکردنەوە لە سەر ژیانی دونیایی ئاسمان بەو پێیەی کە سەرجەم هەژاری وئازارەکانی سەر زەوی کاتین و لەو دونیایەدا قەرەبوو دەبنەوە، وەبەم جۆرە دەبێتە هاندەرنی جووتیاران بۆ خزمەت کردنی گەورەکانیان، بە پیّ ی دەقی وتەی (سانت —پۆل ) دەڵێت: ((... بە کویلەکان رابگەیەنە گوێڕایەڵی گەورەکانیان بن و ڕازییان بکەن ، سەرپێچییان نەکەن)) ، بە تێپەڕبوونی کات کەنیسەی کاتۆلیکی بووە توخمێکی کاریگەری پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و فیکری وسیاسی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی سەدەکانی ناوەڕاست لە ڕۆژئاواو ناوەڕاستی ئەوروپادا[٥٥] ، وەبەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست دەرەبەگایەتی وەك و سیستەمێکی ئابووری وسیاسی پشت بەستوو بووە بە دام ودەزگایەکی ئایینی ، دام و دەزگایەك شەرعیەتی ئایینی دەدا بە هەموو ئەو یاسا ورێسایانەی دەرەبەگایەتی بەرهەمی هێنابوو ،هاوکات دەرەبەگایەتیش چەندین ئیمتیازی

ئابووری وسیاسی بۆ دەسەڵاتی کەنیسەی فەراهەم کردبوو[٥٦]، لە بەر ڕۆشنایی ئەم باسەی سەرەوەدا، ئەوە دەخوێندرێتەوە کەوا کەنیسەی مەسیحی کاتۆلیکی گەورەترین و بەرچاوترین ڕۆڵی گێڕاوە بۆ لە دایك بوونی سیستەمی دەرەبەگایەتی کە وا بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ مرۆڤەکانی بە هیلاك بردبوو ،ئەمە وێڕای ئەوەی کەوا ئەزێت وئەشکەنجەو ئازاری جەستەیی بە کار دەهێنا، جا بۆیە دەڵێین کەنیسە وپیاوەکانی فاکتەرێکی تر بوونە بۆ ئەو مەبەستە،چونکە لە دڵ ودەروونی مرۆڤەکانی ئەو دەمە جێی خۆیان کردبوویەوە، وەتا ڕادەیەکی باشیش زاڵ بوونییان دیار بوو لەگەڵ دەسەڵاتی زەمەنی دا، هەرچەندە لەو لاشەوە دەسەڵاتی زەمەنی بۆ خۆیشی بەرەولاواز بوون و داڕووخان دەچوو، ئەمەش وایکرد دەرگا بۆ جۆرە سیستەمێکی وەها واڵا بکات. بە مەبەستی زیاتر ئاشنا بوونمان بە سیستەمی دەرەبەگایەتی لە ئەورووپای سەدەکانی ناوڕاست دا، پێویستە زیاتر وفراوانتر ڕۆبچین ولێی قووڵ بینەوە، وەئاگاداری ئەوە بین داخۆ ئەم دیاردەیە چ بوارێك دەگرێتە خۆی وەپەیوەندی بە کێوە هەیە، وە تاچ ئاستێك کاریگەری هەبووە لە ژیانی کۆمەڵگەی ئەورووپادا، وەلە هەمان کاتیش گرنگە بزانین چۆن ولە سەر چ جۆرە بنەماو ڕێسایەك دانراوە ،واتە ڕوونتر بڵێین کەوا بنەڕەتی ئەم سیستەمە لە سەر چی دامەزراوە؟ پێش هەموو شتێك دەبێت ئاگاداری ئەوە بین کەوا ژیان لە کۆمەڵگەی ئەورووپی لە سەدەکانی ناوەڕاست دا، ملکەچی دوو هۆکاری گرنگ بووە ،یەکەمییان زاڵبوونی کەنیسەی کاتۆلیکی لە لایەنی ڕوحی وڕۆشنبیرییەوە، دووەمییانیش بوونی سیستەمی دەرەبەگایەتی وەك و بنکەیەك بۆ ژیانی ئابووری[٥٧]، سیستەمی نێوبراوو بنەڕەتی ڕێکخەری ئابووری سەدەکانی نێو براوو بووە ، وەلە سایەی دا خەڵك دابەش دەکرانە سەر دوو چینی

سـەرەکی[٥٨]، ئـەویش چـینی فـەرمانڕەوا بـوو کـە زەوییـان هـەبووە ، وەچـینی مەحکومیش ئیش وکاری تێدا دەکرد[٥٩]، وەخاوەنی زەوی بۆ خۆی حاکم وقـازی و سەرکردەی سەربازی وکۆکەرەوەی باجیش بووە[٦٠]، ئەم سیستەمە ڕاوبۆچـوونێکی فـرەی لـە بـارەوە هەیـە کـە ئایـا سیـستەمی ڕامیارییـە ،یـان ئابوورییـە یـاخود کۆمەڵایەتییـە ،؟!. بـۆ نموونـە بەشـێك لـە مێـژوو نووسـان وادادەنـێن کـەوا دەرەبەگایەتی هەموو دەزگا غەیرە ئایینییەکان دەگرێتەوە[٦١]، بەڵام (پۆلادی) لـە پەرتوکەکـەی دا باسـی لـەوە کـردووە کـەوا سیـستەمی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی سـەدەکانی ناوڕاسـتی ئـەورووپا بـریتی بـووە لـە سیـستەمی فیـودالی واتـە دەرەبەگایەتی[٦٢]، وەهەروەها لە هەندێ شـوێنی تـریش دا ،دەرەبەگایـەتی وەك و سیستەمێکی ئابووری وڕامیـاری وکۆمەڵایـەتیش باسـی لێـوە کـراوە[٦٣]، ڕەنگـە لـە ڕاستی دوور نەکەوینەوە ئەگەر بڵێین ژیان بە شێوەیەکی گشتی بۆ ماوەیەکیش لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا، تاڕادەیەکی زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگەری وهەژموونی سیستەمی دەرەبەگایـەتی، هـەر بۆیـە دەکرێـت بڵێین زۆر بـواری گرتۆتـە خـۆی، چـونکە بـە یارمەتی کۆمەڵێك فاکتەر بووە بە خاوەن دەسەڵات.

ئەو پایانەی سیستەمی دەرەبەگایەتی لەسـەری دامـەزراوە بەشـێوەیەکی گشتی سیانن:

یەکەم: بوونی سەردارێکی فیودالی خاوەن زەوی وخاوەن دەسـەڵاتی فـەرمان ڕەوایی، دووەم :بوونی کۆیلەی زەوی، ئینجائابووری وکشتوکاڵی کـە سـێیەمییان پێك دەهێنێت[٦٤]، وەهەروەها بنەڕەتی سیستەمی نێوو براو لەسەر بنـەمای تیـۆری گرێبەندی نێوان وپاشـاکان وموڵکـدارانی فیـوداڵ وئاسـتە جیاوازەکـانی موڵکـدارە فیوداڵـەکان لەگـەڵ یـەکتردا دامـەزراوە[٦٥]، وەهـەر لەسـایەی ئـەم سیـستەمەدا

سیستەمی حوکم وسیستەمی کۆمەڵایەتی بەسترابوو بە موڵکییەتی زەوی ،وەئەم بەستنەش قایم وجێگیر بووە[٦٦]،شایانی باسە دەرەبەگاکان دەسەڵاتێکی فراوانی سیاسیان لە خاکی خۆیان دا هەبووە ، سەرەڕای بوونی سوپایەکی تایبەتی سوارە ،زەوییەکەی بەرهەم هێنی بنەڕەتی نێو سەدەکانی ناوڕاست بووە ،ئەویش بۆ دوو بەش دابەش دەبوو کەبەشێك هی دەرەبەگ بوو کە پێ ی دەگوترا (دۆمین )، بەشێکی دیکەی جووتیار ئیشی تێدا دەکرد لە بەرامبەر بە خششێکی دارایی وئەرکێك لە بەرژەوەندی خاوەن زەوی بە جێبگەیەنێت[٦٧]، وە هە روە ها ناوچە کا نی زێر دە سە لاتی سیستە می نێوبراوو بە تا یبە تی لە سە دە ی با زدە یەم بە دواوە لەهەندێ ڕووەوە سوودیان لە یاساکانی ڕۆم وەرکرتووە[٦٨]. کەواتە دەکرێ هەم کەنیسە وهەم دەرەبەگایەتی لە بەرژەوەندی یەکتر کاریان کردبێت .وەسەبارەت بە جووتیارەکانیش دەبینین دابەش دەبوون بۆ دوو دەستە، جووتیاری ئازاد وەجووتیاری کۆیلەکان کە لە نێو دۆمین دا بوون[٦٩]، وەهەر وەها لەم سیستەمەدا دەسەڵاتی حکومەت لە نێوان دەرەبەگەکان دا دابەش کرابوو[٧٠]، وەئەگەر بمانەوێت لە سەر پلەوپایەی خودی سیستەمی دەرەبەگایەتی بدوێین، ئەوە پێویستە هەرەمەکەی کەنیسە وپیاوانی بهێنینە بەرچاووی خۆمان، چونکە هەمان هەرەم لەم سیستەمەش دا بە دی دەکرێت. ئەوەتا لەنێو هەرەمی دەرەبەگیشدا گەورە(تیجان)ەکان وەك و شا ودۆقەکان هەبوون، ئەوانە چینی باڵای دەرەبەگی بوون، ماف ڕاگەیاندنی جەنگ ولێدانی دراوی تایبەتی خۆیان هەبوو، دوای ئەوان بە پێی هەرەمی دەرەبەگی (بارۆن) دەهات کە خاوەن موڵکی چەند زەوییەکی فراوان بوون کە دەگەیشتە دەیان زەوی و چەند دەرەبەگێکی بچووکتر شوێنکەوتەی بوون، سوارەکان لە پلەی خوارووی هەرەمەکەدان کە

چەکهەلگرەکان شوێنکەوتەیان بوون، ئەوانیش بە تێپەربوونی کات دەبوون بە سوارە، هەموویان چینی خانەدانەکانییان پێکدەهێنا کە لە سەدەکانی ناوەراستدا دەسەلات داربوون، پاشان جووتیارە ئازادەکان وکۆیلەکان هەبوون کە ئەرکی چالاکیە بەرهەمهێنەکانی نێو کۆمەلگەی دەرەبەگی لە سەرشانی ئەوان بوو[٧١]، هەموو ئەمانە وامان لێناکات کەوا باس لەو درندەییە یان نەکەین، چونکە سزادانی دەرەبەگایەتی توند بووە، توندییەکی وەحشیانە[٧٢]، وەسەردەمی دەرەبەگایەتی پربووە لە جەنگ وململانێی دەرەبەگایەتی کە سوارەکان هەلیاندەگیرساند[٧٣]، هاوشێوەی ئەو کارە نامرۆییانەی کەنیسەی مەسیحی بووە کە بە درێژایی ناوەراست بە کاریان دەهێنا بەرامبەر بە کۆمەلگا ،وە ناشبێت بە لامانەوە سەیر بێت چونکی هەردوو لایان پالپشتی یەکتریان دەکرد و کارو کردەوەکانییان گۆرینەوەی بەرژەوەندییەکانییان بووە لە سەر حسابی کۆمەلگەدا ، هەرچەندە کەنیسە رۆلی هەبووە لە سەردانی ئەم سیستەمە، بەلام تارادەیەکی باشیش رکابەرییەك لە ئارادا هەبووە لە نێوان هەردوو لادا. چونکە دەبێت لە یادمان نەچێت لە مێژووی ئەورووپادا هەرکات پاشایاکی بە هێز پەیدا بووایە کە پێکهاتە فیودالییەکانی بخستایەتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە، وولات بەرەو چەقبەستن وپێکهاتەیەك دەچوو کەبە دەولەت ناو دەبرا، وەبە پێچەوانەشەوە لاوازی پاشا دەبووە هۆی پەرت وبلاوبوونی زیاتر وسەرهەلدانی مولکداری تایبەتی سەرزەمینەکان[٧٤]، وەلە رووی کارگێریشەوە زیاتر لە دەولەتێکی بچووکی ناو دەولەتێکی گەورە دەچوو کە شوێنکەوتەیی بۆ دەولەتە گەورەکە هەبێت ، دەرەبەگ گەورەی ئەویٚ بوو و هەموو مافە رامیاری ودادوەرییەکانی لە دەست بوو ،دەیتوانی جووتیارانی ئیشکەری ناو زەوییەکەی دادگایی بکات یان لێییان خۆش

بێت یان لە سێدارەیان بدات، وەهەروەها دەرەبەگەکان قەڵایان هەبووە،قەڵای دەرەبەگەکان لە ماوەی سەدەکانی (دەیەم ) و(یانزەیەم) دا لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا بڵاوبوونەوە، وەك و کۆشکی دەرەبەگی وا بوون[٧٥]. لە مەوە ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە کەوا هاتنی دەرەبەگایەتی وسەرهەڵدانی وڕەنگدانەوەی لە سەر مێژووی ئەورووپای ڕۆژئاوای سەدەکانی ناوەڕاست، نەگبەتی و مەرگەسات و داروخان و قوڕغ کاری وکاولکارییەکی تر بووە، بۆ ژیانی ئابووری وکۆمەڵایەتی وڕامیاری لە کۆمەڵگەی ئەورووپادا .

دیارە سیستەمی دەرەبەگایەتیش وەك و بەشێك لە مێژووی دیاری ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست، کە زیاتر لە سەرەتای سەدەکانی نێو براوودا بە دیار کەوت بەردەوام بووە وکاریگەری وڕۆڵی خۆی گێڕاوە لەو مێژووە بەرچاوەی مرۆڤایەتی، بەڵام لە هەمان کات دا هەر لە سەرەتای مێژووی نێو براوودا سیستەمی دەرەبەگایەتی هاوشێوەی هەموو دیاردەو ڕووداوەکانی نێو کۆمەڵگادا گۆڕانی بە سەر دا هاتووە، واتە ڕوونتر بڵێین سیستەمی دەرەبەگایەتی لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست دا ڕووی لە لاواز بوون و داڕووخان کردووە، بەڵام وا دیارە ئەمەش چەندین هۆکار هەبووە بۆئەم مەبەستە، وەهەروەها تێپەڕاندنی قۆناغی دەرکەوتن وڕەنگدانەوەو بێگەیشتنی وڕووخانی لە سەرە خۆ بووە ، وەئەم گۆڕانکارییەش زیاتر لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست داڕووی داوە و هاتۆتە کایەوە، واتە لەگەڵ ڕۆژهەڵات بوونی سەردەمی ڕێنیسانس ئیدی ئەم سیستەمە ناتوانێت جارێکی تر بەو شێوەیە سەر وەدەر بنێت. لەو هۆکارو فاکتەرە بنەڕەتییانەی سیستەمی دەرەبەگایەتی ڕووخاند ،ئەو گۆڕانکارییە بوو کەلەماوەی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست دا ڕویدا[٧٦]، وەهەروەها لە گەڵ دەرکەوتنی شۆڕشی

بازرگانی و گەشەکردنی شارە سەربەخۆکان لە کۆتایی سەدەکانی نێو براوودا، دەستە وکۆمەڵێکی نوێ لە خەڵکی دەرکەوتن وەلە دەرەوەی چوار چێوەی ژیانی دەرەبەگایەتی دەژیان، رۆڵەکانی ئەم دەستەیە مومارەسەی بازرگانی وپیشەگەری بچووکی ئازادییان دەکرد، لەو شارانەی کە تازە دروست بوویوون[٧٧]، ئەم دەستەیە بە چینی (بۆرجوازی) یاخود چینی (ناوەڕاست) ناسراویوون لە نێو کۆمەڵگەدا. واتە لە هۆکارەکانی هەرەس هێنانی سیستەمی دەرەبەگایەتی، دەرکەوتنی چینی بورجوازی بوو ،کە چینی ناوەڕاست بوون وەسامانێکی گەورەیان پێك نا کە بۆ بارمەتییانی دا بۆ رەکابەریتی میرە دەرەبەگەکان ،وەهەروەها (مقرحی) باس لەوەش دەکات کەوا لە دوای سەدەی سیازدەوە جگە لە ناو دەرەبەگایەتی بوونی نەما[٧٨] بۆیە رەنگە دوور نەکەوینەوە لە راستی ئەگەر بڵێین کەنیسەش رۆڵی هەبووە لە رووخانی ئەم سیستەمەدا . لەبەر رۆشنایی ئەم باسەدا ئەوەمان بۆ بە دیار دەکەوێت کەوا سیستەمی دەرەبەگایەتی وەك و بەشێك لە مێژووە، تەمەنێکی دووروودرێژی بردۆتە سەر، کە لێوان لێو بووە لە جەورو ستەم وزوڵم وتاوانکردن بەرامبەر بە کۆمەڵگەی ئەورویای رۆژئاوادا، بەڵام هاوکات لە گەڵ هەنگاونانی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست بۆمێژووی نوێ گەلێك گۆڕانکاری هاتە کلیەوە ،واتە هەر لە سەرەتای سەردەمی رینیسانس و کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست کۆمەڵێك گۆڕانکاری رادیکاڵی لە ژیانی فیکری وئاییني ورۆشنبیری وکۆمەڵایەتی وئابوورییەوە سەری هەڵدا ،وەخودی رووخانی سیستەمی نێو براوو یەکێکە لە سیماو خەسڵەتە دیارەکانی سەردەمی رینیسانس ،واتە نەمان ورووخانی دەرەبەگایەتی زەنگێکی دڵ خۆشکەرە بوو بۆ کۆمەڵگەو سەردەمی رینیسانس ،بێ گوومان ئەمەش کۆمەڵێك فاکتەری لە پشتەوە بووە، بەڵام لە

سەرووی هەموویانەوە دەرکەوتنی چینی ناوەڕاست یاخود بورجوازی بوو ،ئەم چینە گەورەترین وکاریگەرترین وبەرچاو ترین ڕۆڵی گێراوە، لە مێژووی ڕووخانی ئە و سیستەمە کە بەشێکی لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست دا بۆ خۆی داگیر کردووە ،یاخود بە شێوێکی تریش دا دەتوانین بڵێین ئەم سیستەمە لە رووی تەمەنەوە بەرەو پیر بوون ونەخۆش بوون دەچووە، وەلەوانەشە بە بچووکترین هۆکار ڕۆحی لەبەر نەمایە ببایەتە هۆی مردن ولە نێوچوونی.

## پەراوێز و سەرچاوەکان

[1] صالح ،محمد محمد ،تأريخ اوربا من عصر النهچه وحتى اليوره الفرنسيه ،بغداد،١٩٨٢،ص١٧٠.

[2] ئەحمد،سامان حوسێن:ڕەهەندەکانی ڕیفۆرمی ئایینی لە ئەوروپا ،دهۆك ،٢٠٠٧،ص٤٤.

[3] صالح، المصدر السابق ،ص١٧١.

[4] ئەحمەد،سەرچاوەی پێشوو،ل٤٤.

[5] صالح، المصدر السابق ،ص ١٧١ – ١٧٢ .

[6] ئەنور ،کەیوان ئازاد ،مێژووی ئایینەکان ، سلیمانی ،٢٠٠٩،بەرگی یەکەم ،ل١١٩–١٢٠.

[7] سليمان ،على حيدر ،تاريخ الحچاره الّورويبه الحديپه ،بغداد ،١٩٩٠،ص٢٧.

[8] صالح، المصدر السابق ،ص١٧١.

[9] ئەنوەر ،سەرچاوەی پێشوو،ل١١٩ – ١٢٠.

[10] سليمان ،المصدر السابق، ص٢٦.

[11] فلاوێرز، سارا :چاکسازی ، و: چنور فەتحی ،سلیمانی ،٢٠٠٧، ل١٩.

[12] أمين ،عبدالّمير محمد :حسين ،محمد توفيق :تأريخ أوربا فى العصور الوسگى ،جامعه بغداد ،( بدون سنه الگبع) ،الكتاب الّول ص ٣٦٩.

[13] صالح ، هاشم :مدخل إلى التنوير الاوروپى ،بيروت ، ٢٠٠٥ ،ص ٢٤.

[14] حەننا ،جۆرج ،چیرۆکی ئادەمیزاد ، و: ڕەوف زوهدی ، سلیمانی ،٢٠٠٧،ل ١٦٢.

[15] صالح ، هاشم، المصدر السابق ،ص ٣١.

[16] صالح ، هاشم، المصدر نفسه،ص ٢٦.

[17] عەزیز، حەمید : بنەڕەتەکانی فەلسەفە، سلیمانی ،٢٠٠٤ ،ل١٨٦.

[18] ئەحمەد،سەرچاوەی پێشوو،ل٤٨ – ٤٩.

[19] حەننا،سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٢.

[20] ئەحمەد،سەرچاوەی پێشوو،ل٣٥.

[21] حەننا،سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٣.

[22] أمين ،المصدر السابق ،ص ٣٧٠.

[23] أمين ،المصدر نفسه ،ص٣٧١.

[24] ئەحمەد،سەرچاوەی پێشوو،ل٣١ – ٣٢.

[25] ئانفین ستیگن ، فەلسەفە لە مێژوودا ( پوختەیەك ) ، و:فەرۆخ نیعمە پوور ،سلیمانی ،٢٠٠٩ ،ل ٤٨ –٤٩.

[26] حەننا،سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٢– ١٦٣.

[27] ئەحمەد،سەرچاوەی پێشوو،ل ٤٩.

[28] عەزیز، حەمید: فەلسەفە ولاهوت لە سەدەکانی ناوەڕاست دا ،سلیمانی ،٢٠٠٦،ل١٨٧.

[29] عەزیز ،بنەڕەتەکانی فەلسەفە ،ل١١.

[30] ئەحمەد،سەرچاوەی پێشوو،ل ٥٤ –٥٥.

[31] مەزهەر ،کەمال : (ڕێنیسانس ) لە گەڵ باسێکی تر بە ناو نیشانی ئەدیب وئەرکەکانی قۆناغ ،و:فوئاد مەجید میسری ،سلیمانی ،٢٠٠٤ ،ل١٣٤.

[32] الیوسف ،عبدالقادر أحمد : العصور الوسطی الاوروپیە ،بیروت ،١٩٦٧ ، ص ٢٥١.

[33] ئەحمەد،سەرچاوەی پێشوو،ل ٥٥.

[34] الیوسف،المصدر السابق ،ص٢٥٠.

[35] ئەحمەد،سەرچاوەی پێشوو،ل ٥٥.

[36] مەزهەر ، سەرچاوەی پێشوو ،ل ١٣٤.

[37] ئەحمەد،سەرچاوەی پێشوو،ل ٥٥.

[38] مەزهەر ، سەرچاوەی پێشوو ،ل ١٣٥.

[39] ئەحمەد،سەرچاوەی پێشوو،ل٣٢.

[40] عەزیز ،بنەڕەتەکانی فەلسەفە ، ل١٢٤.

[41] صالح ، غانم محمد : بیری سیاسی کۆن وناوەڕاست ،سەید سادق ،٢٠٠٥ ،ل ٣١٣.

[42] المقرحی ،میلاد .أ.: موجز تأریخ أوروپا الحدیپ والمعاصر ، بنغازی ،١٩٩٨، ص١٩.

[43] مراد ، خلیل علی وئاخرون :دراسات فی التأریخ الاوروبی الحدیپ والمعاصر ، جامعە الموصل ،١٩٨٨،ص٢٩.

[44] برۆن جفری :پوختەی مێژووی ئەوروپا لە کۆنەوە تائەمڕۆ ،و: نیهاد جلال حبیب الله ،ناوەندی ڕۆشنبیر ،٢٠٠٩.،ل١٣٥.

[45] الیوسف،المصدر السابق ،ص١١٧.

[46] فرح ، نعيم :تأريخ أوريا السياسى فى العصور الوسگى ،جامعه دمشق ،٢٠٠١ –٢٠٠٢ ،ص١١.

[47] مراد، المصدر السابق ،ص٢٧.

[48] برۆن ،سەرچاوەی پێشوو ،ل١٣٥.

[49] ديورانت ،ول، قصه الحچاره (عصر الآيمان ) ،ت : محمد بدران ، مصر ،٢٠٠١، ج(١٣ –١٤ ) ،من لمجلد (٧) ،ص٤٣١.

[50] نهرو ،جواهر لال : لمحات من تأريخ العالم ،ت ، لجنه من الّساتژه الجامعيين،بيروت ،١٩٧٩،ص٤٠.

[51] سليمان ،المصدر السابق، ص١٨.

[52] المصدر السابق ،ص١١٨.

[53] قاسم ،قاسم عبده : ماهيه الحروب الصليبيه،الكويت ،١٩٩٠ ، ص١٠.

[54] مقرحى ، المصدر السابق ، ص١٨ .

[55] ئەحمەد،سەرچاوەی پێشوو،ل٤٧.

[56] مەزهەر ، سەرچاوەی پێشوو ،ل ١.

[57] شكرى ، محمد فؤاد ، أنيس ، محمد ، أوروبا فى العصور الحديثه ، مكتبه الانجلو المصريه ، ١٩٦١، الجزو الّول ، ص١١.

[58] نعنعى ، عبد المجيد ، :أوربا فى بعچ الّزمنه الحديثه والمعاصره ، بيروت ،١٩٨٣ ،ص١٩.

[59] شكرى ، أنيس ، المصدر السابق ،ص١٤.

[60] عمرا ن، محمود سعيد ، تأريخ أوروبا فى العصور الوسگى ،بيروت ،٢٠٠٦ ،ص٢٠٩.

[61] اليوسف،المصدر السابق ،ص١١٨.

[62] پۆلادی ،کمال :مێژووی هزری سیاسی لە رۆژئاوا لە سوکراتەوە تا ماکیافیلی ، و:ئازاد وەلەدبەگی وسیروان زەندی ،هەولێر ،٢٠٠٥،بەرگی یەکەم ،ل١٢٧

[63] شكرى ، أنيس ، المصدر السابق ،ص١٤.

[64] صالح ،غانم محمد، سەرچاوەی پێشوو،ل٣١٥.

[65] پۆلادی ،سەرچاوەی پێشوو،ل١٢٧.

[66] عمرا ن، المصدر السابق ،ص٢٠٨.

[67] برۆن ،سەرچاوەی پێشوو،ل١٣٧.

[68] پۆلادی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٧.

[69] برۆن، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٧.

[70] پۆڵادی ،سەرچاوەی پێشوو،ل١٢٨.

[71] برۆن ،سەرچاوەی پێشوو،ل١٣٨.

[72] ديورانت ، المصدر السابق ،ص٤٣٨.

[73] برۆن ،سەرچاوەی پێشوو،ل١٣٩.

[74] پۆڵادی ،سەرچاوەی پێشوو،ل١٢٨.

[75] برۆن ،سەرچاوەی پێشوو،ل١٣٨–١٣٩.

[76] الأدهمي ، محمد مظفر ، تأريخ أوربا الحديث (عصر النهضة_ الثورة الفرنسية) ،بغداد ١٩٨٩، ص٩.

[77] نعنعی ، المصدر السابق ،ص٢٠.

[78] مقرحی، المصدر السابق ،ص١٩.

# میر بادی دۆستەکی

دەشتی ئیسماعیل ئۆمەر

## بەشی یەکەم

### تەوەری یەکەم

ناو و نازناوی: X

سەرچاوە مێژووییەکان بیروبۆچوونیان جیاوازە دەربارەی ناو و نازناو و ڕەچەڵەکی ئەم میرە. هەندێکیان دەڵێن (باد کوڕی دۆستەك) (ابو عبدالله حسین کوڕی دۆستەک)ە[١]. هەندێك دەڵێن (باد) نازناویەتی و ناویشی (ابو عبدالله حوسێن کوڕی دوشنک)ە[٢]. هەرچی (ابن الاثیر)ە لەم بارەیەوە دوو ڕیوایەتی هەیە، یەکەم دەڵێت (باذ ابو عبدالله حوسێن کوڕی دوستك)[٣]. و لە ڕیوایەتی دووەمدا دەڵێت "هەندێ لە هاوڕێیانمان لە کوڕانی حەمیدی ئەوانەی کە گرنگی دەدەن بە هەواڵی باذ لەلایان درکاندم کە ئەو بە ابو شجاع بەناوبانگە و ناویشی باذە و ابو عبدالله حوسێن برای باذە"[٤]. لە سەرچاوەی تردا هاتووە کە (باذ) نازناوەتی و ناویشی ابو عبدالله کوڕی حوسێن کوڕی ذوشنک)ە[٥].

بەڵام لە سەرچاوە کوردییەکان ئەم میرە بەشێوەی تر ناوی هاتووە، لە یەك لە سەرچاوەکاندا هاتووە (حوسێن کوڕی دوشتك)ە و نازناوی (شجاع)ە و کونیەکەشی (باز)ە[٦]. هەروەها بە (باز ابو شجاع)یش ناوی دەهێنرێت[٧]. و لە هەندێ سەرچاوەدا کە باس لەو میرە دەکرێت بە (پاد کوڕی دوستك) ناوی هاتووە

و ئاماژە بەوەش کراوە کە ووشەی (پاد) بە مانای گەورە یاخود دەسەڵاتدار یان پادشا دێت[٨]. و لە سەرچاوە فارسییەکاندا بە (باز ابو شجاع حوسێن ناوی دێت[٩].

بەڵام سەرەڕای ئەم بیروبۆچوونانە دەربارەی ناو و نازناو و ڕەچەڵەکی ئەم میرە ئەوەی زیاتر لە ڕاستی نزیکە و پشتی پێدەبەستریٚ ئەوەیە کە ئەم میرە ناوی (ابو عبدالله حوسێن کوڕی دوستك)ە و نازناویشی (باد)ە[١٠]، هەرچی ناوی (باژ)یشە ئەوا زۆر پشتی پیٚ نابەسترێت چونکە پیتی (ذال) لە زمانی کوریدا نییە، تەنها لە شێوەزاری هەورامیدا نەبێت، ناوچەی هەورامانیش دوورە لە شوێنی سەرەتای دەرکەوتنی ئەم میرە و ڕووداوەکانی سەردەمی ئەم میرە[١١]. وە هەرچی ناوی (باز)یشە کە لە سەرچاوە کوردییەکاندا زیاتر بەو ناوەوە دەناسرێت لەوانەیە ئەو ناوە بۆ خێرایی ئەم میرە بگەڕێتەوە کە وەکو باڵندەی (باز) کە لە زمانی عەرەبیدا بە مانای (صقر) دێت لە فراوانکردنی دەسەڵاتی و دەستبەسەرداگرتنی شار و قەڵاکان[١٢]. سەبارەت بە ناوی باوکیشی (دوستەك) زۆرترین ئاماژەی بۆ کراوە کە دەگونجێت لەگەڵ هەردوو زمانی کوردی وفارسی بە پێچەوانەی هەردوو ناوی (دوشتك، ژوشنك)[١٣].

تەوەری دووەم

هۆزەکەی:

وەکو چۆن ناو و نازناوی ئەم میرە لە سەرچاوەکان بیروبۆچوونی جیاوازیٚ لە سەرە بەهەمان شێوە بیروبۆچوونی جیاواز هەیە دەربارەی ئەو هۆزەی کە ئەو میرەی بۆ دەگەڕێتەوە.

زۆر له مێژوونووسان کۆکن لەسەرئەوەی کە ئەم میره بۆ هۆزی (حەمیدی) دەگەڕێتەوە[14]. هەروەها ئاماژە بەوەش کراوە کە (باد) لە کوڕەکانی حەمیدیە و ـوکی لە ناوچەکە بۆ دیاربەکر[15] کۆچی کردووە، لەدوای ناکۆکی لەنێوان خۆی کوڕی مامی[16]. بەڵام تەنها فارقی دەڵێت "باد لە هۆزی حار بوختی"یە[17]. لە ـستیدا هۆزی حەمیدیش یەکێکە لەو هۆزە کوردییانەی کە لە (عقره – ئاکرێ) و ـدوروبەری ژیاون کە شاری (عەقرە) دەکەوێتە باکوری موسڵ و نازانرێ ئاخۆ چۆن ئەم میره یاخود باوکی ئەو ناوچەیەیان جێهێشتووە، هاتوونەتە دیاربەکر کە ـدووری ئەم دوو ناوچەیە چەند ڕۆژێکە[18].

یەکێك لە لێکۆڵەرەوەکان ئەوە نیشاندەدات کە (باد) لە هۆزی حەمیدی نییە و لە هۆزی حار بوختی یە لەبەرئەوە شیکردنەوەیەك دەکات بۆ بیروبۆچوونی خۆی و دەڵێت: (حار بوخت) ووشەیەکی لێکدراوە کە ووشەی حار بەمانای (ڕەسەن) دێت، وە وشەی (بخت) کە دواتر بوو بە (بوختان، بوهتان، بۆتان) کە بەپێی سەردەمە مێژووییەکان بۆ ناوچەی بۆتان کە دەکەوێتە جەزیرەی (ابن عمر)[19] بەکارهاتووە[20]، وە (حار بخت) تا سەردەمی فارقی بۆ ئەو ناوچەیە بەکارهاتووە، کە ئێستا بە (شیروا) دەناسرێتەوە بوختیەکان نیشتەجێ بووینە لە باشووری بۆتان، وە حار بوختییەکانیش کوردەکانی ناوچەی (شیروا) بووینە، ئەم دوو هۆزەش بۆ یەك ڕەسەن دەگەڕێنەوە، بەڵام لێکۆڵەر لە کۆتاییدا بوختییەکان بۆ حەمیدییەکان دەگەڕێنێتەوە[21].

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە ئەوەی زیاتر پشتی پێدەبەسترێت سەرەڕای جیاوازی بیر و بۆچوونەکان مێژوونووس فارقی یە چونکە مێژوونووسێکی سەردەمی ڕووداوەکانی ئەم میره کوردەیە، و ئەم مێژوونووسە ئاماژەی بەوە نەداوە کە میر (باد) لە هۆزی حەمیدی بێت.

تەوەری سێیەم

سەرەتای ژیانی:

حکومەتی دۆستەکی لە دەوروبەری ساڵی (٣٢١ك) (٩٣١ز) لەلایەن دۆستەك کە کەسایەتییەکە لە هۆزی حەمیدی دەمەزراوە، کە لەگەڵ هەندێك لە پیاوانی هۆزەکەی هێرشی سەر دیاربەکریان کردووە، و ئەم میرە لە سەرکەوتنەکانی بەردەوام بوو تا ساڵی (٣٣٩ك) گەیشتە سنووری جەزیرە. وە ئەم میرە مایەوە بە میری هۆزی حەمیدی تاوەکو مردنی لە ساڵی (٣٤٨ك)[٢٢]. وە لە شاری (سعرد)[٢٣] شاردرایەوە. ئەم میرە کوڕێکی هەبوو بە ناوی (باز) کە ناوی منداڵی (حوسێن) بووە و نازناوی (عبدالله)شی لەسەر بووە، کە لە ساڵی (٣٢٤ك) لە شاری دیاربەکر هاتۆتە دنیاوە، لە ئازایەتی و پیاوەتی بێ وێنە بووە[٢٤]. لە قەد و قەڵافەت و باڵای نیشانەی بزورگی و زرنگی تیادا دیاربووە[٢٥]. و بەڕوو سامناك و بە هەیکەل و کەڵەگەت بووە[٢٦]. هەر لەکاتی کوڕێنییەوە ناوبانگ و شۆرەتی بە ناو ئاسۆ و خێڵەکانی کوردا بڵاوبۆتەوە، وە ئازایەتی ناوی ئەم میرە پەرەیسەند و ناوبانگی چۆتە دڵی خەڵکییەوە[٢٧].

(باد) لە سەرەتای ژیانیدا مەڕی لەوەڕاندووە، و زۆر بە خۆوە و بەسام بووە، و بەردەوام ڕێزی لە خەڵك گرتووە و بەزەیی بە هەژار و کەم دەرامەتەکاندا هاتۆتەوە و یارمەتی داون[٢٨]. ماوەیەك کاری جەنگاوەری کردووە و هەرچی دەستی کەوتووە بەسەر ڕەفیقانیدا دابەشی کردووە[٢٩]. کاتێك تەمەنی گەیشتۆتە دوانزە ساڵی لەسەر دەستی باوکی فێری خوێندن و نووسین بووە و پاشان لە شاری دیاربەکر فێری شەڕکردن بووە[٣٠].

سەبارەت بە لەوەڕاندنی ئاژەڵیش لەلایەن ئەم میرە لە سەرەتای ژیانیدا ئەمە شتێکی ئاسایی بووە لەناو هۆزە کوردییەکان کە بۆ بەردەوامبوونی ژیانی خۆیان خەریکی بەخێوکردنی ئاژەڵ و مەڕ و مالات ڕەواندن بوون[٣١]. بەلام (محمد امین زەکی) ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم ڕیوایەتە هەڵبەستراوە چونکە ئەمە لە عەقڵ دوورە میرێکی هۆزێکی گەورە هەڵبسێت بە کاری جەردەیی و ئاژەڵ بەخێوکردن بەڵکو ئەم میرە هەر لە سەرەتاوە لێهاتوو بووە و برەوی بە دەسەلاتی خۆی داوە و دەسەلاتی خۆی سەپاندووە[٣٢]. لەم بارەیشەوە دەکرێت بڵێین کە ئەم میرە لە سەرەتای ژیانیدا خەریك بووە بە کاری ئاژەڵداری نەك بە میرایەتییەوە.

بەشی دووەم

تەوەری یەکەم

فراوانبوونی دەسەلاتی میر باد:

ئەگەر تێبینی بکەین دەبینین لە مێژووی میرنشینە کوردییەکان کە کاتێك میرەکان هەلیان بۆ ڕەخساوە دەستیان کردووە بە پەیداکردنی لایەنگری و چەسپاندنی دەسەلات و فراوان کردنی سنووری حکومیان و بەهێزکردنی لایەنی سەربازی و دارایی خۆیان.

میر باد لە سەرەتادا لە کەوشەنەکانی دیاربەکردا زۆر غەزای دەکرد[٣٣]. ڕوزراوری دەڵێت "باد هەمیشە لەناو چەتە خۆییەکان لەگەڵ دەوڵەتی ڕۆم لەشکرکێشی دەکرد"[٣٤]. وە لەدوای ئەوی کە بازنەی قەڵەمرەوی خۆی زیاد کرد لەشکرێکی باشی پێکەوەنا کەوا لەشکرێکی ڕێك و پێك و پڕ چەك بوو، و دەستی کرد بە زەوتکردنی ناوچەکانی دەوروبەری خۆی، و ئەوەندەی پێنەچوو هێرشی

کردە سەر ئەرمینیا[٣٥] و دەستی گرت بەسەر ئەرجیس دا[٣٦] کە بەپێی ئامۆژەی سەچاوەکان یەکەم ناوچە بووە کەوتۆتە ژێر دەستی میر (باد)ەوە[٣٧]. وە (ئەرجیش) لە نووسینە مسمارییەکان بەناوی (ارزشکو) هاتووە و ئێستاش بە (اجنتن) دەناسرێت[٣٨]. داگیرکردنی ئەم شارە بووە هۆیەکی گرنگ بۆ (باد) و سەربازەکانی بۆ متمانە بەخۆ کردن بۆ زیاتر فراوانکردنی دەسەڵاتی و دەستبەسەرداگرتنی ناوچەکانی تر بۆیە زیاتر غەلەبی کرد و ڕووی کردە (دیاربەکر) لەلای ڕۆژئاوا، و لەبەر هیوای بڵندی میر باد ئەم شارەی بە سووك و ئاسانی خستە ژێر دەستی خۆیەوە[٣٩]. لە ساڵانی (٣٤٥– ٣٤٦ك) بەشێکی زۆری شاری جەزیرە و شاری بەدلیسی[٤٠] ڕزگارکرد، و شەش مانگ دوای ئەمەش مەلازگرد[٤١] و دەوری گۆمی وانی گرت، و لەجێگای شاری (عادل جوان) شاری (شاباد)ی بنیاتنا، کە لەدواییدا کەوتە دەست مەلیك (عادل)ی ئەیوبی و ناوی گۆڕدرا بۆ (عادل جوان)[٤٢]. میر باد بەردەوامبوو لە فراونکردنی دەسەڵاتی و دەستی گرت بەسەر ئامەد[٤٣] و حصن کیفا[٤٤] و هەکاری[٤٥] و جەزیرەی ابن عمر.

میر باد دواتر شاری دیاربەکری کردە پایتەختی خۆی[٤٦]، و نازناوی (شجاع)ی وەرگرت لەلایەن خەلیفەی عەباسی لە بەغدا، و دوو سکەی بەناوی (شجاع) لێدا کە ئەمەش نیشانەی بەهێزی و سەربەخۆیی ئەم میرە نیشان دەدات[٤٧]. لە ساڵی (٣٦٢ك) خەلیفەی فاطمی لە میسر (معزالدین الله) نازناوی (ملك شجاع)ی پێبەخشی[٤٨].

بەشێوەیەکی گشتی دەسەڵاتی ئەم میرە ارزن[٤٩] و مەلازگرد و دیاربەکر و ئەرجیش و هەندێ ناوچەی باکوری ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی وانی دەگرتەوە، و هەندێ لە ناوچەکانی باشووری ڕۆژئاوای دەریاچەی وان[٥٠].

تەوەری دووەم

سنووری جوگرافی میرنشینی دۆستەکی:

لە ڕاستیدا دیاریکردنی سنووری میرنشینی دۆستەکی کارێکی ئاسان نیە چونکە ئەم میرنشینە لە سەردەمی میر باد لە هەندێ کاتدا دەسەتی بەهێز بووە و دەستی کردووە بە فراوانخوازی خۆی، و لەهەندێ کاتیش ئەم میرنشینە دەسەڵاتی لاوازبووە، یاخود لە هەندێ شەڕ لەگەڵ هۆزەکانی دەوروبەر سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە و زۆر لە ناوچەکانی ژێر دەستی کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی هێزە داگیرکەرەکانی ئەوکات.

بەڵام دەتوانین بەشێوەیەکی نزیکەیی سنووری میرنشینی دۆستەکی دیاریبکەین ئەویش بە دەست نیشانکردنی ئەو ناوچە وشارانەی کە بۆ ماوەیەکی زۆر دەسەڵاتی ئەم میرنشینە تێیدا ماوەتەوە و چەسپاوە. لە سەرەتادا ئەم میرنشینە دامەزراوە لە باکوری کوردستان کە هەموو زەوییەکانی ویلایەتی دیاربەکر و ماردین و سعرد و بدلیس و بەشێك لە ویلایەتی موسڵ و ئەرجیش و بەشێك لە حسن زیاد و ڕەها و وانی دەگرتەوە، لەگەڵ بەشێك لە ناوچەکانی باشوری کوردستان تاوەکو ڕووباری دیجلە[٥١]. وە گرنگترین شارەکانی میرنشینی دۆستەکی ئەمانە بوون: (امد، میافارقین، نصیبین، ارزن، جزیرەی ابن عمر، بدلیس، خەلات، أرجیش، حصن کیفا)[٥٢]. بەڵام ناوچەی حیزان[٥٣] کە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای دەریاچەی وان ماوەیەك لەژێر دەستی ئەم میرنشینە بووە[٥٤]. بەڵام یەك لە لێکۆڵەرەوەکان ڕووبەری میرنشینی دۆستەکی زیاتر لە (٦٠٠٠٠ کم) دادەنێت[٥٥]



تەوەری سێیەم

ئەو هۆکارانەی کە یارمەتیدەربوون لە دەرکەوتنی میرنشینی دۆستەکی:

لەسەدەی چوارەمی کۆچی بارودۆخێکی لەبار دروست بوو بۆ ئەو هۆزانەی کە هەوڵی بەدەستهێنانی سەربەخۆییان دەدا، ئەویش بەهۆی لاوازی خیلافەتی عەباسی، ئەمەش بووە هۆکارێکی ڕێخۆشکەر بۆ دەرکەوتنی چەند میرنشینێکی کوردی لە ناوچەکە وەکو ( هەزبانی، شەدادی، حەسنەوەیهی و ڕەوادی)، وە یەکیکی تر لە گرنگترین ئەو میرنشینانە کە دەرکەوت لە ناوچەکە لەو ماوەیەدا میرنشینی دۆستەکی بوو لە ساڵانی (٣٧٢-٤٧٨ك/ ٩٨٢-١٠٨٦ز) کە چەند هۆکارێکی ناوخۆیی و دەرەکی ڕۆڵیان هەبوو لە گەشەردن و دەرکەوتنی ئەم میرنشینە.

هۆکارە ناوخۆییەکان :

١- بەهێزی و توانایی میر باد.

٢- لاوازی خیلافەتی عەباسی لە ناوچەکە[٥٦].

٣- شوێنی جوگرافی میرنشینی دۆستەکی و ڕووی لە مەکەزی خیلافەت[٥٧].

٤- دەرکەوتنی چەند میرنشینێکی کوردی وەکو حەسنەوەی هی و ڕەوادی و شەدادی و هەزبانی لە ناوچەکە کە هۆکارێك بوو وەکو ڕێخۆشکەێك بۆ هەوڵدانی ئەم هۆزە بۆ دامەزراندنی میرنشینێکی سەربەخۆ[٥٨].

هۆکارە دەرەکییەکان :

١- ململانێ لەنێوان خیلافەتی عەباسی و بوەیهییەکان لە لایەك و بێزەنتییەکان لەلایەکی تر[٥٩].

٢- کەمی هێزەکانی بوەیهی لەو ناوچانەی کە میر (باد) هەوڵیدەدا دەسەڵاتی خۆی تێدا فراون بکات[٦٠].

٣- بوونی ناکۆکی لەناو بوەیهییەکان دوای مردنی عضد الدولە[٦١] کە ڕۆڵی هەبوو لە دروستکردنی بارودۆخێکی لەبار تا برەو بە دەسەڵاتی خۆی بدات[٦٢]

٤- یارمەتی بەشنەوییەکان خاوەنی قەڵای فنك لە ناوچەی بۆتان بۆ میرنشینی دۆستەکی و چوونەپاڵ میر باد لە کاتی شەڕە دەرەکیەکانی[٦٣].

٥- دەرکەوتنی دەوڵەتی فاطمی و وەستان دژی خیلافەتی عەباسی و پەیوەندیکردن بە میرنشینی دۆستەکی[٦٤].

بەشی سێیەم

پەیوەندیە دەرەکییەکانی میر باد و کوژرانی

پەیوەندیە دەرەکییەکانی میر باد:

سەرەتای دەرکەوتنی میر باد دروستبوونی میرنشینی دۆستەکی خیلافەتی عەباسی لە ناوچەکە بەرەو لاوازی چووبوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی بوەیهییەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو، و دەسەڵاتە سیاسییەکەیان لەژێر دەستی خیلافەتی عەباسی دەرهێنابوو[٦٥]. بەڵام لەگەڵ ئەوەی خیلافەتی عەباسی دەسەڵاتە سیاسییەکەی خۆی لەدەست دابوو لەهەمان کاتدا وەکو ڕەمزێکی ئاینی لە جیهانی ئیسلامی مابووەوە وەکو ڕێزگرتنێك لە پلە و پایەی پیرۆزی خەلیفە لەلایەن موسوڵمانان[٦٦].

سەبارەت بە پەیوەندی خیلافەتی عەباسی لەگەڵ میر بادیش سەرچاوە کۆنەکان هیچ ئاماژەیەکیان بەم پەیوەندییە نەکردووە و تەنها لە سەرچاوە

نوێیەکاندا باسکراوە، بۆ نموونە سەرچاوەیەك ئاماژەی بەوە کردووە کە کاتێك میر باد دەستی بە فراوانکردنی دەسەلاتی خۆی کردووە لە ڕێگای هێزەوە خەلیفەی عەباسی دانی بە دەسەلاتی ناوە[٦٧]. و کاتێك خەلیفەی عەباسی لە بەغا ناوی ئەم میرەی بیستووە نازناوی (ابو شجاع)ی پێداوە، و لەناو میرنشینەکەش وتاری هەینی بەناوی میر (باد) و خەلیفەی عەباسی خوێندراوەتەوە[٦٨].

(عبدالرقیب یوسف) ئاماژە بەوە دەکات کە میر بادی کوردی پەیوەندی هەبووە بە خیلافەتی عەباسی ئەویش بۆئەوەی تا شەرعییەت بە دەسەلاتی خۆی بدات لەڕێگای ناوهێنانی خەلیفە لە ووتاری هەینی و لێدانی ناوی خەلیفە لەسەر دراو بەلام لە هەمان کاتدا ئەم میرە لە کاروباری ناوخۆدا سەربەخۆ بووە[٦٩]. و میر بادیش پاش ئەوەی دەستی بەسەر موسلدا گرتووە هەولی داوە کە خیلافەتی عەباسی لە بەغدا ڕزگار بکات بە دەرکردنی بوەیهییەکان[٧٠]. سەرچاوەکان بە هیچ شێوەیەك ئاماژەیان بە هیچ شەڕێکی دیار نەکردووە لەنێوان میر باد و خیلافەتی عەباسی، بۆیە دەتوانین بلێین کە تاڕادەیەك پەیوەندی هەبووە لەنێوان میر باد و حیلافەتی عەباسی ئەویش بە پشت بەستن بە سەرچاوە نوێیەکان.

تەوەری یەکەم

پەیوەندی میر باد لەگەل دەولەتی بێزەنتی:

سەرەتا پەیوەندییەکانی میر باد و بێزەنتییەکان پەیوەندییەکی دوژمنکارانە بووە چونکە لە کاتی دامەزراندنی میرنشینی دۆستەکی میر باد لە ناوچە-توخوبییەکان لەگەل دەولەتی بێزەنتی لەشکرکێشی دەکرد[٧١]. بەلام دوای هەلاتنی میر باد لە موصل دوای چاوپێکەوتنی لەگەل (عضد الدولە)ی بوەیهی سالی (٣٦٨ك) هەلوێستی بەرامبەر دەولەتی بێزەنتی گۆڕا و دەستی کردە خۆ

نزیککردنەوە و پەیمانی لەگەڵیان بەست و ساڵانە دیاری بۆ ئیمپراتۆر (بسلیۆسی دووەم) دەنارد[٧٢]. ئەم لە یەك نزیکبوونەوەیەی میر باد و بێزەنتییەکان بووە مایەی ترسی بوەیهییەکان بۆیە دەستیان کرد بە خۆ نزیك کردنەوە لە دەوڵەتی بێزەنتی، دوای گفتوگۆیەکی زۆر بە داننان بە دەسەڵاتی بێزەنتییەکان لە هەندێ ناوچەی ژێر دەسەڵاتی بوەیهییەکان (بسلیۆسی دووەم) ڕازی بوو بە بەستنی پەیمان لەگەڵ بوەیهییەکان[٧٣]. بەڵام دوای مردنی (عچد الدولە) دەوڵەتی بێزەنتی لەو پەیمانانەی کە بەستبووی پەشیمان بووە و دووبارە شەڕ دەستی پێکردەوە لەنێوان هەردوو لا[٧٤].

لەکاتی شەڕی نێوان بوەیهییەکان و بێزەنتییەکان بۆمان دەرکەوێت کە میر باد زۆربەی کاتەکان پشتگیری دەوڵەتی بێزەنتی بووە و خۆی بەوانەوە بەستۆتەوە بۆ سوود وەرگرتن بۆ دامەزراندنی میرنشینەکەی، بۆیە دەکرێت بڵێین کە ئەوەش یەکێك بووە لە هۆکارە یارمەتیدەرەکانی دامەزراندنی میرنشینی دۆستەکی[٧٥].

تەوەری دووەم

پەیوەندی میر باد لەگەڵ دەوڵەتی فاتمی:

جێگای ئاماژەیە سەرچاوە کۆنەکان باسی ئەم پەیوەندییەیان نەکردووە تەنها لە سەرچاوە نوێیەکان نەبێت.

لەکاتی دەرکەوتنی بانگەوازی فاتمی لە ئەفەریقاوە بەرەو ناوچەکانی ڕۆژهەڵات هات بەمەبەستی دەست بەسەرداگرتنی خیلافەتی عەباسی و حوکمکردن بەناوی جیهانی ئیسلامی[٧٦]. دواتر دەسەڵاتیان گواسترایەوە بۆ میسر پاشان دەستیان بەسەرداگرت لە ساڵی (٣٥٧ك/ ٩٦٩ز) بەم شێوەیە بانگەوازی

فـاتمی چـووە قۆنـاغێكی نـوێ و زۆر ناوچـەی گرتـەوە[٧٧]. پاشـان فاتمییـەكان ناوچەكانی شام و جەزیرەیان بە دەرگایەك زانی بۆ هاتنە ناو عێراق بۆیە دەستیان كرد بە پەیوەندیكردن بە میرەكـان و دەسـەڵاتدارانی ئـەم ناوچـانە تـاوەكو بـەلای خۆیان ڕایان بكێشن دژی خیلافەتی عەباسی[٧٨].

سەبارەت بە پەیوەندی میرنـشینی دۆستەكی لـە سـەردەمی مـیر بـاد لەگـەڵ فاتمییەكان ئاماژە بەوە كراوە كاتێك كە میر باد دەسـتی گـرت بەسـەر میافـارقین خەلیفەی فـاتمی (معزالـدین الله) لـە سـاڵی (٣٦٢ك) وەفـدێكی نـاردە لای مـیر بـاد لەگەڵ كۆمەڵێك دیاری بەنرخ و نازناوی (ملك شجاع)یـشی پێبەخـشی[٧٩]. هـەروەها پاش ئەوەی والی فاتمییەكان بەناوی (بكجور) لەكار لادرا لەلایەن خەلیفـەی فـاتمی (العزیز بالله) (٣٦٥–٣٨٤ك) بەرەو رقە[٨٠] هات و دەستی بەسەردا گـرت لـە سـاڵی (٣٧٧ك) و هەوڵیدا پەیوەندی بـە مـیر بـاد بكـات، بـەڵام مـیر بـاد هـیچ وەڵامێكـی نەدایەوە ئەویش بـەهۆی خـەریك بـوونی بـە شـەڕ كـردن لەگـەڵ بوەیهییـەكان بـە مەبەستی ڕزگاركردنی ناوچەكان و فراوانكردنـی دەسـەڵاتی خـۆی لـە دەوروبـەری موسڵ، بۆیە دەكرێت بووترێ لەسەر ئەو بنەمایە میر بـاد پەیوەندییـەكی سیاسـی باشی هەبووە لەگەڵ فاتمییەكان[٨١].

تەورەی سێیەم

پەیوەندی میر باد لەگەڵ بوەیهییەكان:

سـەرەتای سـەردەمی مـیر بـاد هاوچـەرخ بـوو لەگـەل! مـیر (عـچد الدولـە)ی بـوەیهی، و لەسـەرەتادا پەیوەنـدی دۆسـتایەتی لـەنێوان ئـەم دوو مـیرە هـەبوو، بەڵگەش بۆ ئەمە میر باد لە ساڵی (٣٦٧ك) یارمەتیەكی زۆری پێشكەش بـە (عـچد الدولە) كرد دژی سەركردەی ئەوكاتی حەمدانییەكان (ابو تغلب الحمدانی)[٨٢] كە لـە

ئەنجامدا بوەیهییەکان توانیان سەرکەوتن بە دەستبهێنن[83] و پاشان دەستیان بەسەر شاری موسڵدا[84] گرت.

دوای ئەوەی کە بوەیهییەکان شاری موسڵیان دەست کەوت میر (عضد الدولە) هاتە ئەم شارەوە و میر باد بۆ دیدەنی چوو، و میری بوەیهی لە چاوپێکەوتنی ئەم سەردارە کوردە سامی لێ نیشت و بیری خراپی کردەوە، و دوای ئەوەی کە میر باد لە مەجلیس چووە دەرەوە (عضد الدولە) بە ئامادەبووانی ڕاگەیاند کە ئەم میرە بۆ ئێمە تەهلەکەیە و ژیانی زەرەرە بۆیە برسیاری دا بە گرتنی، بەڵام میر باد لە یەکەم نەزەری (عضد الدولە) هەستی بە دڵپیسی میری بوەیهی کرد و خێرا لە شار چووە دەرەوە و خۆی گەیاندە لەشکرەکەی[85]. لە ساڵی (٣٧٢ك) (عضد الدولە) کۆچی دوایی کرد و (صمصام الدولە)[86]ی کوڕی دەسەڵاتی گرتە دەست، لەم کاتەشدا میر باد دەستی بەسەر نصیبین دا گرت، ئەم هەواڵەش بووە مایەی ترسی (صمصام الدولە) بۆیە لەشکرێکی پێکهێنا بەسەرکردایەتی (ابو سعد بهرام کوڕی اردشێر) و ناردی بۆ شەڕکردن لەگەڵ میر باد. میری کوردیی دوای بیستنی ئەم هەواڵە بەرەوڕووی چوو، و شەڕێکی قورس لەنێوانیاندا ڕوویدا و لە ئەنجامدا میر باد سەرکەوتنی بەدەستهێنا و (ابو سعد بهرام) شکا و زۆر لە سەربازەکانی بەدیل گیران[87]. پاش ماوەیەك لە ساڵی (٣٧٣ك) (صمصام الدولە) دووبارە لەشکرێکی پێکهێنا بەسەرکردایەتی (ابی قاسم سعد بن محمد الحاجب) و ناردی بۆسەر میر باد و هەردوو لەشکر لە خاپووری حسینی کە دەکاتە نزیك زاخۆی ئێستا لە شوێنێکدا بەناوی (باجیلایا) بەرەنگاری یەکتر بوونەوە، ئەم جارەش لەشکری بوەیهییەکان شکا و زۆریان لێ کوژرا و زۆریشیان لێ بەدیل گیرا، و ئەوەی دەربازیش بوو خۆی گەیاندە موسڵ، بەڵام لەم کاتەدا خەڵکی موسڵ لە (سعد بن محمد) ڕاپەڕین و میر باد دەستی گرت بەسەر شاری موسڵ[88].

پاش ئەوەی میر باد لە موسڵ دەسەڵاتی جێگیر بوو دەستی کرد بە رێکخستنی لەشکر بۆئەوەی ئەمجارەیان بەغدای خیلافەتی عەباسی لەژێر دەستی بوەیهییەکان رزگار بکات، و کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە (صمصام الدولە) کەوتە ترس بۆیە لەشکرێکی بەهێزی ئامادەکرد، بەسەرکردایەتی بەهێزترین سەرکردەی سوپای بوەیهی بەناوی (زیاد کوڕی شهدا کویە)، ئەم لەشکرە ڕووی کردە موسڵ و شەڕێکی گەورە ڕوویدا و لە ئەنجامدا میر باد شکا[٨٩]. پاش شکانی میر باد گەڕایەوە بۆ دیابەکر بۆئەوەی دووبارە خۆی ئامادە و رێك بخاتەوە دژی لەشکری بوەیهییەکان ئەگەر هاتوو بەرەو ناوچەکانی دیاربەکر و میافارقین هاتنە پێشەوە بەڵام لەم کاتەدا (زیاد کوڕی شهدا کویە) هەڵسا بە ناردنی دوو قۆڵ لەشکر یەکێکیان بەسەرکردایەتی (ابی قاسم سعد بن محمد) بۆ سەر جەزیرەی (ابن عمر) لە ڕۆژهەڵات[٩٠]. ئەویتر بەسەرکردایەتی (شکر الخادم) کە پۆلێکە لە پۆلەکانی سەربازی و زۆربەی لە تورکەکان پێکدەهات بۆسەر شاری نصیبین لە ڕۆژئاوا[٩١]. بەڵام ئەم دوو لەشکرە گەڕانەوە و نەچوونە سەر میر باد[٩٢]. هۆکارێکی ئەم هەڵگەڕانەوەیەش ئاماژەی بۆ نەکراوە تەنها هەندێکیان بۆئەوەی دەگەڕێننەوە کە ئەو ترسەی باد دروستی کردبوو لە دڵی بوەیهییەکان دوای سەرکەوتنی لە شەڕی (باجیلایا) یاخود ترسی لەشکری بوەیهییەکان بەهۆی دوورکەوتنەوەیان لە بنەکەی سەرەکی خۆیان لە بەغدا و موسڵ[٩٣].

دوای سەرنەکەوتنی هێرشە دوو قۆڵیەکەی بوەیهییەکان میر باد دەستی کرد بە کۆکردنەوەی خەڵك لە دەوری خۆی بۆ خۆ ئامادەکرنێکی تازە لە دژی لەشکری بوەیهییەکان، لەم کاتەشدا (ابن سعد) وەزیری (صمصام الدولە) نامەیەکی نارد بۆ (سعد الدولە الحمدانی)[٩٤] بە مەبەستی هاوکاریکردن بۆ کوشتنی میر باد بەرامبەر

دانـی دیاربـەکر بـە (سـعد الدولـە) وە ئـەویش ڕازی بـوو و سـوپایەکی نـارد بـۆ میافارقین بەڵام تووشی بەرگرییەکی بەهێز بووەوە لەلایـەن سـوپای بـاد و شـکا و گەڕایـەوە دواوە[٩٥]. پـاش سـەرنەکەوتنی بوەیهییـەکان ولایەنگرەکـەیان کـە حەمدانییەکان بوون ئەم جارەیان هەوڵیان دا بە فێڵ میر باد بکوژن، بۆیـە (سـعد الدولە) پیاوێکی نارد بۆ کوشتنی میر باد. ئەم پیاوە چووە ناو ڕشماڵەی باد و بـە شیرەکەی لە میر بادی دا بەڵام بە هەڵە لەجیاتی لە سەری بدات لە قاچەکانی دا و لەبەر ترس بەخێرایی ڕایکرد[٩٦]. بەڵام ئەمە نـەبووە هـۆی هەرەسهێنانی لەشـکری باد بەڵکو بۆ شەڕی داهاتوو باشـتر خۆیـان ئامـادە کـرد، بـەم جـۆرە ئـەمجارەش (سعد الدولە) سەرکەوتوو نەبوو لە کوشتنی باد[٩٧].

بارودۆخ بەم شێوەیە بەردەوام بوو تا ساڵی (٣٧٤ك/٩٨٤ز) ئـەو کاتـە مـیر بـاد داوای سوڵحی کرد لە (زیاد بن شهدا کویە)، و ئەویش ڕازیبوو. بەم پێیـە دیاربـەکر و بەشێك لە تور عبدین[٩٨] بۆمیر باد بێت[٩٩]. و پاشان (صمـصام الدولـە) لـە موسـڵ لەشـکرێکی زۆری جێهیـشتوو خـۆی گەڕایـەوە بەغـدا[١٠٠]. بـەڵام سـاڵی (٣٧٧ك/٩٨٧ز) (صمصام الدولە) کۆچی دوایی کرد و (اشرف الدولە)[١٠١] لە شوێنی ئەو دەسەڵاتی گرتە دەست، ومیر بادیش دوای ئەم کارەساتە هیچ لە بـیری خـۆی لای نـەدا و ویـستی خەیاڵـە کۆنەکـەی هـەر بباتـە سـەر بۆیـە دوای ئـەوەی (سـعد الحاجب) لـە سـاڵی (٣٧٧ك) کۆچـی دوایـی کـرد بـە لەشـکرێکی زۆرەوە ڕووی لـە موسڵ کرد، و (اشرف الدولە) (ابـا نـصر خوشـاذ)ی نـارد بـۆ حاکمییـەتی موسـڵ. کاتێك (ابا نصر) گەیشتە موسڵ و هەواڵی زۆری لەشـکری مـیر بـادی بیـست داوای یارمەتی لە (شرف الدولە) کرد، بەڵام میر بـاد (ابـا نـصر)ی ناچـار کـرد کـە داوای یارمەتی لە هەردوو هۆزی بنوعقل و بنـو نمـیر بکـات[١٠٢]. ئـەم دوو هـۆزەش زۆر لـە

پیاوانی خۆیان نارد و یەکیان گرت لەگەڵ هێزی بوەیهی، و شەڕێکی قورس و گەورە لەنێوان هەردوو لادا ڕوویدا و لە ئەنجامدا میر باد شکا و براکەشی بەناوی (ابو الفوارس) کوژرا[103]. بەڵام لەم کاتەدا هەواڵی مردنی (شرف الدولە) گەیشت بۆیە سوپای بوەیهی کەمێك کشایەوە موسڵ و دەسەڵاتی میر باد لە دیاربەکر و تور عەبدین هەر قایم بوو[104].

پاش ماوەیەك هەردوو کوڕانی ناصر الدولەی حەمدانی[105] بەناوی (ابو طاهر و ابو عبدالله) هاتن لە سوریاوە، و لەشکرێکیان پێکهێنا لە عەرەبەکانی (بنو عقیل و بنونمیر) ویستیان بێنە سەر موسڵ بەڵام نەیانتوانی بۆیە پەنایان بردە بەر (محمد بن المسیب) کە میری هۆزی (ابنو عقی) بوو و خەڵکی موسڵیش بە نهێنی لەگەڵ (ابو طاهر) ڕێککەوتبوون، و ئەم ڕێکەوتنە کە لەنێوان کوڕانی حەمدانی و (ابن المسیب) هاتە ئاراوە بەپێی ئەم ڕێکەوتنە موسڵ و دەوروبەری بۆ حەمدانییەکان بێت و نصیبین و جەزیرەش بۆ (ابن المسیب) بێت[106].

تەوەری چوارەم

کوژرانی میر باد:

دوای ئەوەی (ابو عبدالله و ابو طاهر) موسڵیان دەستکەوت میر باد ویستی ئەم هەلە بقۆزێتەوە و موسڵ بگەڕێنێتەوە ژێر دەستی خۆی و لەشکرێکی بەهێزی پێکهێناکە شەش هەزار کەس دەبوو[107]. و کوڕەکانی (بشنوی) خاوەنی قەڵای (فبنك) بوونیان لەم لەشکرەدا هەبوو[108]. میر باد لای ڕۆژهەڵاتەوە ڕووی کردە موسڵ و کوڕانی حەمدانیش هەوڵیان دا کە ڕووبەڕووی ببنەوە، بەڵام هەستیان بە بێ هێزی کرد بەرامبەر لەشکرەکەی میر باد بۆیە پەنایان بردە بەر میری عوقەیلیەکان کە ناوی (ابی زواد محمد بن المسیب العقیلی) بوو، و پاشان ڕێکەوتن

لەنێوان هەردوو لادا دروست بوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی میر باد[109]. لەم کاتەدا (ابـو طاهر) هەولێدا لە بەرامبەردا ڕووبەڕووی لەشکری میر باد ببێتەوە و هێرش بکاتـە سەری، و (ابو عبدالله و ابـن المسيب)یـش لـە بـاکوری موسـڵ لـە پـەنای ڕووبـاری دیجلە لە دواوە ڕوویان لە لەشکری میر باد کـرد[110]. کاتێـك مـیر بـاد ئـەم هەواڵـەی بیست هەولێدا لە شاخ نزیك ببێتەوە بـەڵام لەبـەر شـپرزەیی لـە وڵاغەکـەی کەوتـە خوارەوە، و لەم کاتەش (ابو علی) خوشکەزای لێی نزیك کەوتـەوە و پێـی ووت بـا بتگەیەنمە لەشکر بەڵام میر باد پێی ووت ئێوە بڕۆن و واز لە من بهێنن، بۆیـە (ابـو علی) بەناچاری میر بادی جێهێشت و لەگەڵ پێنج سـەد سـوار ڕووی کـردە شـاخ و دەرچـوو[111]. پاشـان یـەك لـە کـوڕانی (بنـو عقیـل) لـەناو برینـدارەکان مـیر بـادی ناسـییەوە و زۆر بـێ بەزەییانـە سـەری بـڕی و بـردی بـۆلای کـوڕانی حەمـدانی و لاشەکەیان لە (دار الاماره) لە موسڵ هەڵواسی، بـەڵام هەنـدێك لـە خـەڵکی موسـڵ بەم کارە دڵگران بوون و ووتیان چۆن دەبێت زاتێکی وا پاك کە بەرگری لە ئیسلام کردووە بەم جۆرە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت بۆیـە جەسـتەکەیان هێنایـە خـوارەوە و کفنیانکردو لە مەراسیمێکی تایبەت ناشتیان[112].

سەبارەت بە ساڵی کوژرانی میر باد زۆربەی مێژوونووسان ئاماژە بەوە دەدەن کە لە ساڵی (٣٨٠ك/٩٩٠ز) کوژراوە[113]. تەنها فارقی نەبێت ئاماژە بەوە دەکات کـە میر باد ئاماژە بەوە دەکات کە میر باد لە (١٤)ی موحـەرەمی سـاڵی ٣٨٠ك/ ٩٩٠ز کوژراوە[114].

## پەراوێزەکان :

[1] ئیبنو ئەزرەقی فارقی، مێژووی میافارقین و ئامەد، و: قادر، ئاکو بورهان، چ١، (هەولێر:٢٠٠٧)، ل١٤.

[2] الرونراوري، ذيل تجارب الأمم، (مصر: ١٩١٦)، ج٣، ص٨٤.

[3] ابن الاثير، الكامل في تأريخ، (بيروت: ٢٠٠٢)، ج٧، ص٤١٦.

[4] م. ن، ج٧، ص٤١٦" بطرس البستاني، دائرة المعارف، (بيروت: د.ت)، مج٥، ص٤١.

[5] ابن خلدون، تأريخ ابن خلدون، (بيروت: ١٩٨٦)، ج٣، ص٤٣٢.

[6] حوسێن حوزنی موکریانی، دێرێکی پێشکەوتن، (هەولێر:١٩٦٢)، ل٤.

[7] محمد لمین زکی، خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، ب١، (سلیمانی:٢٠٠٤)، ل٤٢" شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، چ٣، (هەولێر: ٢٠٠٦)، ل٢٩.

[8] عبدالرقیب یوسف، الدولة الدوستكية، ط٢، (اربیل: ٢٠٠١)، ص١٥" قادر محمد رۆڵی لاوان لە پێکهێنانی دەسەلاتی سیاسی کوردی لە سەدەکانی ناوەڕاست، گۆڤاری پێشکەوتن، ژمارە (١٤٧)، (هەولێر: ٢٠٠٦)، ل٦٩.

[9] بابا مردوخ روحاني، تاريخ مشاهير كرد، ض٢، (تهران:١٣٨٢هـ)، ص٣٧.

[10] فارقي، س. ث، ل١٤" ابن شداد، الاعلاق الخطيرة في أمراء الشام و الجزيرة، (دمشق: ١٩٧٨)، ج٣، ٣٧٢" ابو فداء، المختصر في أخبار البشر، (القاهرة: د.ت)، ج٢، ص١١٨" فائزة محمد عزت، الكرد في اقليم الجزيرة و شهرزور في صدر الاسلام، رسالة ماجستر مقدمة الى مجلس كلية الآداب في جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩١)، ص٣٦.

[11] فرست مرعي، الامارات الكردية في العصر العباسي الثاني، ط١، (اربيل: ٢٠٠٥)، ص٢٣٢.

[12] موکریانی، س. پ، ل٤" صالح قفتان، مێژووی نەتەوەی کورد، (بەغدا: ب. س)، ل١٩٦.

[13] فارقي، س. ث، ل٤١" الروذراوري، م. س، ص٨٤.

[14] نفس المصدر، ص٨٤" ابن الاثير، م. س، ج٧، ص١٥٠" ابن العديم، بغية الطلب في تأريخ الحلب، ط١، (بيروت: ١٩٩٨)، ج٣، ص١٣٠.

[15] دیاربەکر وڵاتێکی گەورە و فراوانە و دەکەوێتە ڕۆژئاوای دیجلە و بەسەر نەسیبیندا دەڕوانێت. یاقوت الحموی، معجم البلدان، (بیروت: د.ت)، ج٢، ص٤٩٤.

[16] موکریانی، س. پ، ل٦.

---

[17] مێژووی میافارقین و ئامەد، ل١٤.

[18] عبدالرقیب یوسف، الدولة الدوستكیة، ص٣٦- ٣٧.

[19] جزیرەی ابن عمر: شارێكە دەكەوێتە سەرووی موسڵ لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە و باكوری جەزیرەی فوراتی، و دانیشتوانەكەی كوردن. یاقوت الحموی، معجم البلدان، ج٢، ص١٣٨.

[20] عبدالرقیب یوسف، م.س، ص٣٦.

[21] م. ن، ص٣٦.

[22] موكریانی، س. پ، ل٧.

[23] شاری اسعرد: سعرتیشی پێدەووترێ كە دەكەوێتە لای شاخولێكەیەكی نزیك دیجلە، و یەك ڕۆژ و نیو لە میافارقین دوورە. س. پ، (هوامش)، ل٢١.

[24] محمد امین زكي، مشاهیر الكرد و كردستان، ( بغداد: ١٩٤٥)، ص٤٨" موكریانی، س. پ، ل٧.

[25] ابن الاثیر، م. س، ج٧، ل٤١٦" صالح قفتان، مێژووی گەلی كورد، چ٢، (هەولێر: ٢٠٠٥)، ل١٥٩.

[26] الروذراوري، م.س، ج٣، ص٨٤" فارقي، س. ث، ل١٤.

[27] فرست مرعي، م. س، ص٢٣٧.

[28] ابن الاثیر، م. س، ج٧، ص١٥١.

[29] محمد امین زكی، خولاصەیەكی تاریخی كورد و كوردستان، ل٤٢" عبدالرقیب یوسف، الدولة الدوستكیة، ص٤١.

[30] محمود یاسین التكریتي، الامارة المروانیة في دیاربكر و جزیرة، رسالة ماجستر مقدمة الی مجلس كلیة الآداب بجامعة بغداد، (بغداد: ١٩٧٠)، ص٦٠، موكریاني، س. ث، ل٦.

[31] فرست مرعي، م. س، ص٢٣٧.

[32] تأریخ الدول و الامارات الكردیة في عهد الاسلامي، ع: محمد علي عوني، (مصر: ١٩٤٨)، ص٩٥.

[33] فارقي، س. ث، ل١٤" ابن الاثیر، م. س، ج٧، ص١٥١" احمد خلیل، تأریخ الكرد في الحضارة الاسلامیة، ط١، (بیروت: ٢٠٠٧)، ص٢٧٢.

[34] الروذراوري، م. س، ص٨٤.

[35] ارمینیا: هەرێمێکە کە ئەرمەنەکانی تێدا نیشتەجێیە و دابەش دەبێت بۆ سەر دوو ئەرمینیای گەورە کە خەلاّت دەگرێتەوە و ئەرمینیای بچووک کە تفلس دەگرێتەوە. یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج١، ص١٦٠.

[36] أرجیش: شارێکی کۆنە سەر بە ئەرمینیای گەورەیە نزیك ە خەلاّت و زۆربەی خەڵکەکەی لە ئەرمەنە مەسیحییەکانە. یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج١، ص١٤٤.

[37] محمد امین زکي، مشاهیر الکرد و کردستان، ص٤٢.

[38] بطرس البستاني، م.س، ص٥٨٥" کرفان محمد أحمد امیري، الکرد في کتابات المؤرخ ابن الأثیر الجزري، ط١، (اربیل: ١٩٩١)، ص٢٤٥.

[39] فارقي، س. ث، ل٢٢" ابن الاثیر، م. س، ج٧، ص٤١٦" صالح قفتان، مێژووی گەلی کورد، ل١٦٠" بابا مردوخ، م. س، ص٣٧.

[40] بدلیس شارێکە سەر بە ئەرمینیایە و دەکەوێتە نزیك خلات، و درێژییەکەی ٦٥ پلەیە. یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج٥، ص٢٠٢.

[41] مەلازگرد: شارێکی بەناوبانگە لەنێوان ئەخلات و وڵاتی ڕۆم و دەکەوێتە ئەرمینیا، و خەڵکەکەی ئەرمەن و ڕۆمن. یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج٥، ص٢٠٢.

[42] مەلا خالید فریزی، پوختەیەك لە مێژووی کورد لە سەرەتاوە تا ئێستا، (هەولێر: ٢٠٠٥)، ل٩٦.

٤٣ ئامەد: گەورەترین شارە لە دیاربەکر و لە هەمووان بە ناوبانگترە، و شارێکە لە سەر تەپۆلکەیەکە و ڕووباری دیجلە دەوری داوە. یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج١، ص٥٦.

[44] حصن کیفا: شارێك و قەلاّیەکی گەورەیە بەسەر دیجلەدا دەڕوانێ ودەکەوێتە نێوان ئامەد و جەزیرەی ابن عمر لە دیاربەکر. یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج٢، ص٢٦٥.

[45] هەکاری: ناوچەیەکە دەکەوێتە سەرووی موسڵ لە ەزیرەی ابن عمر، کە کوردەکانی هەکاری تێیدا نیشتەجێن. یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج٥، ص٤٠٨.

[46] شوکرولاّی بابان، مێژووی کورد و کوردستان، (هەولێر: ٢٠٠٤)، ل٩٧" ابن تغر بردي، نجوم الزاهرة في ملوك مصر و القاهرة، (مصر: د. ت)، ج٤، ص١٤٥.

[47] موکریانی، س. ث، ل١٤" مەلا خالید فریزی، س. پ، ل٩٦.

[48] هـ.س، ل١٤.

[49] ارزن: شارێکە بەناوبانگە، لە نزیك ئەخلات و قەڵای بەهێزی تێدایە. یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج1، ص150.

[50] فارقي، س. ث، ل14" لازاريف و آخرون، تأريخ كردستان، ت: عبدي حاجي، ط1، (اربيل: 2006)، ص55.

[51] احمد خليل، م. س، ص272" بابا مردوخ، س. ث، ص97.

[52] ابن الأثير، م. س، ج7، ص416" قادر محمد الامارات الكردية في عهد البويهي، ص34.

[53] حيزان: يەك لە شارەكانی ئەرمینیایە و دەكەوێتە نزیك ئەسعەرتی دیاربەكر. یاقوت الحوي، معجم البلدان، ج2، ص331.

[54] شەرەفخانی بەدلیسی: س.پ، ل29.

[55] عبدلارقيب يوسف، الدولة الدوستكية، ص22.

[56] بروانە: الماوردي، الأحكام السلانية و الولايات الدينية(بغداد: 1989)، ص34.

[57] قادر محمد، م. س، ص58.

[58] عبدالرقيب يوسف، دەوڵەتی دۆستەكی لە كوردستانی ناوەڕاستدا، و: ئەبوبەكر عەلی، چ1، (هەولێر: 1998)، ل17.

[59] فرست مرعي، م.س، ص227– 228.

[60] عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية، ص84.

[61] عضد الدولة: ابو ش جاع فينا خسرۆ كوڕی سوڵتان ڕوكونەدین حسن بوەیهی، یەكەم كەسە لەناو ئیسلامدا بە شاهنشاه ناوبراوە و یەكەم كەسە لە مینبەرەكانی بەغدا بەناوی خەلیفەوە لە ووتاری هەینیدا ناوی دێت، و لەشەوالی (372ك) لە بەغدا مردووە. ابن تغريبردي، م.س، ج4، ص142" ابن خلكان، وفيات الاعيان وانباء ابناء الزمان، (بيروت: د.ت)، ج4، ص50.

[62] ابن الاثير، م.س، ج7، ص432.

[63] م.ن، ج7، ص432.

[64] بروانە: سهيل زكار، في تأريخ العباسي و الأندلسي، ط4، (دمشق: 1991)، ص118" موكریانی، س.ث، ل14.

[65] الماوردي، م.س، ص34" فرست مرعي، م.س، ص227.

[66] قادر محمد حسن، م.س، ص٦٠.

[67] دەسەلاتی میری کوردی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، گۆڤاری شانەدەر، ژمارە ٩، (هەولێر: ١٩٩٨)، ل٢٦.

[68] بابا مردوخ، م.س، ص٣٧.

[69] حضارة الدولة الدوستكية، (بغداد: ١٩٦٧)، ص١١٢.

[70] الروذراوري، م.س، ج٣، ص٨٦" ابن الاثير، م.س، ج٧، ص٤١٦.

[71] الروذراوي، ن.م، ج٣، ص٨٤.

[72] م.ن، ج٣، ص٣٩.

[73] عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية، ص٦٦.

[74] عبدالرقيب يوسف، الحضارة الدولة الدوستكية، ص٥٩.

[75] م.ن، ص٥٩.

[76] سهيل زكار، م. س، ص١٢٠.

[77] قادر محمد، م.س، ص١١٩.

[78] م.ن، ص١١٩.

[79] موکریانی، س.ث، ل١٤" بابا مردوخ، م،س، ص٣٧.

[80] رقە: شارێکی بەناوبانگە لەسەر فورات لەنێوان ئەو شارە و حیزان سێ ڕۆژە، چونکە دەکەوێتە لای ڕۆژهەلاتی. یاقوت الحموي، معجم البلدان،ج٣، ص٥٩.

[81] سهيل زكار، م.س، ص١٧٤.

[82] ابو تغلب الخمداني، الغضنفر ابو تغلب عضد الدولة يەکێکە لە کوڕانی ناصر الدولەی حەمدانی، لە ساڵی (٣٦٩ك) لە ملە کوژراوە. فيصل السامر الدولى الحمدانية في موصل و حلب، ط١، (بغداد: ١٩٧٠) ص٢٧٠– ٢٨٢.

[83] ابن الاثير، م.س، ج٧، ص١٢١" محمد امين زكي، تأريخ الدول و الامارات الكردية، ص٩٦.

[84] موسڵ شارێکی کۆنە و دەکەوێتە سەر ڕووباری دیجلە لە بەرامبەر ەری لەلای ڕۆژهەلاتەوە نەینەویە. یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج٥، ص٢٢٣.

[85] فارقي، س.ث، ص١٤" صالح قفتان، مێژووی گەلی کورد، ل١٦٠.

[86] صمصام الدولة: بەناوبانگەل بە ئەبو کالیجار کوڕی عجد الدولە ی کوڕی بوەیهی، لە ساڵی (٣٨٨ك) لە شیراز کوژرا. ابن تغریردي، م.س، ج٤، ص١٩٨.

[87] الروذراوري، م.س، ج٣، ص٨٦" فارقي، س.ث، ل١٤.

[88] م.ن، ج٣، ص٨٦.

[89] فارقي، س.ث، ل١٤" ابن تغريردي، تأريخ مختصر الدول، (بيروت:١٩٥٨) ج١، ص١٠١.

[90] ابن الاثير، م.س، ج٧، ص٤١٨.

[91] الرونراوري، م.س، ج٣، ص٨٧.

[92] ابن الاثير، م.س، ج٧، ص٤١٨.

[93] الرونراوري، م.س، ج٣، ص٨٥" فرست مرعي، م.س، ص٢٤٥.

[94] سعد الدوله الحمدني: ابو المعالى شريف بن سيف الدوله على بن عبدالله بن حمدان التغلبي، و خاوەنی حەلەبە. ابن تغري بردي، م.س، ج٤، ص١٦١.

[95] ابن الثير، م.س، ج٧، ص٤١٨" الرذراوري، م.س، ج٢، ص٨٦" محمد امين زكي، خولاصەيەكی تاريخی كورد و كوردستان، ل٤٣.

[96] م.س، ج٧، ص٤١٨" صالح قفتان، مێژووی نەتەوەی كورد، ل١٩٨.

[97] الروذراوري، م.س، ج٣، ص٨٦.

[98] طور عبدين: شارۆچكەيەكی سەر بە نەسيبەينە و دەكەوێتە خوار ئەو چيايەی كە بەسەر شارەدا دەڕوانێ، و بەچيای جودييەوە لكاوە. ياقوت الحموي، معجم ابلدان، ج٤، ص٤٨.

[99] ابن الاثير، م.س، ج٧، ص٤١٨" انور مائي، الأكراد في بهدينان، ط٢، (دهوك: ١٩٩٩)، ص١٠٦.

[100] فرست مرعي، م.س، ص٢٤٥.

[101] شرف الدولة: أبو الفوارس شيرزنيل كوڕی عضد الدوله مەليكی بەغدا بووە، لە ساڵی (٣٧٧ك) لە مانگی جەمادی ئاخير مردووە. ابن تغري بردي، م.س، ج١، ص١٧٢.

[102] ابن الاثير، م.س، ج٧، ص٤٣١" فارقي، س.ث، ل١٧" صالح قفتان، مێژووی گەلی كورد، ل١٦١.

[103] ابن خلدون، م.س، ص٥٤٠" شەرەفخانی بەدليسی، س.پ، ل٣٠.

[104] م.ن، ص٥٤٠.

---

[١٠٥] ناصر الدولة الحمداني: ابو محمد الحسن میری حەمدانییە لە موسڵ کە خەلیفە متقی باللە نازناوی (ناصر الدولە)ی پێبەخشی، و لە رەبیعی یەکەمی ساڵی (٣٥٨ك) مردووە. فیصل السامر، م.س، ص٢٠٢– ٢٦٨.

[١٠٦] ابن الاثیر، م.س، ج٧، ص٤٣٢.

[١٠٧] الروذراوري، م.س، ج٣، ص١٧٦.

[١٠٨] ابن الاثیر، م.س، ج٧، ص٤٤٣" فرست مرعي، م.س، ص٢٥٣.

[١٠٩] فارقي، س.ث، ص٢٠.

[١١٠] ابن الاثیر، م.س، ج٧، ص٤٤٣" الروذراوري، م.س، ج٧، ص١٧٧.

[١١١] فارقي، س.ث، ل٢٠" ابن الاثیر، م.س، ج٧، ص٤٤٣.

[١١٢] محمد امین زکی، خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، ص٤٥.

[١١٣] فارقي، س.ث، ل٢٠" ابن الاثیر، م.س، ج٧، ص٤٣٢"الذهبي، سیر اعلام النبلاء، (بیروت: ١٤١٣هـ)، ج١٨، ص١١٩، شەرەفخانی بەدلیسي، س.ث، ل٣٠" صالح قفتان، مێژووی گەلی کورد، ل١٦٢" فرست مرعي، م.س، ص٢٥٤" کرفان محمد، م.س، ص٢٤٦.

[١١٤] مێژووی میافارقین و ئامەد، ل٢٠.

## لیستی سەرچاوەکان

یەکەم/ سەرچاوە کوردییە ڕەسەنەکان:

ئیبنو ئەزرەقی فارقی، أحمد بن يوسف بن الأزرق (ت٥٧٢هـ/١١٧٦م)

١- مێژووی میافارقین و ئامەد، وەرگێڕانی: قادر محمد پشدەری، ئاکۆ بورهان، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، (هەولێر:٢٠٠٧).

میر شەرەفخانی بەدلیسی

٢- شەرەفنامە، وەرگێڕانی: مامۆستا هەژار، چاپی سێیەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، (هەولێر: ٢٠٠٦).

دووەم/ سەرچاوە عەرەبییە ڕەسەنەکان:

ابن الأثير، عزالدين ابي الحسن على بن محمد بن عبدالكريم الجزري (ت٦٣٠هـ/١٢٣٢م)

٣- الكامل في التأريخ، دار المعرفة، (بيروت: ١٣٩٨هـ/١٩٧٨م).

ابن تغري بردي، جمال الدين ابي المحاسن يوسف (٨١٣- ٨٧٤هـ)

٤- النجوم الزاهرة في ملوك مصر و القاهرة، وزارة الثقافة الارشاد القومي، المؤسسة المصرية العامة للتأليف و الطباعة و النشر، (مصر: د.ت).

ابن خلدون، ابو زيد عبدالرحمن بن محمد (ت٨٠٨هـ/١٤٠٥م)

٥- تأريخ ابن خلدون، دار الكتاب اللبناني و مكتبة المدرسة، (بيروت:١٩٨٦م)

ابن خلكان، ابو العباس شمس الدين أحمد بن محمد (ت٦٨١هـ- ١٤٠٥م)

٦- وفيات الأعيان و انباء ابناء الزمان، تحقيق: احسان عباس، دار الثقافة، (بيروت:د.ت)

الذهبي، محمد احمد بن عثمان بن قايماز الذهبي ابو عبدالله
٧- سير علام النبلاء، المحقق: شعيب أناؤط ومحمد نعيم العرقوسي، دار الفكر، طبعة التاسع، (بيروت: ١٤١٣هـ).
الروذراوري، أبو الشجاع محمد بن الحسين ظهير الدين (ت٤٨٧هـ/١٠٩٤م)
٨- ذيل تجارب الأمم، اعتنى بالنسخ و التصحيح: هـ.ف. امردوز، طبع بمطبعة شركة التمدن الصناعية، (مصر المحمية: ١٣٣٤هـ/١٩١٦م).
ان شداد، عزالدين محمد بن علي ابراهيم (ت ٦٨٤هـ/١٢٨٥م)
٩- الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام و الجزيرة، حققه: يحيى عبادة، منشورات وزارة الثقافة و الارشاد القومي، (دمشق: ١٩٧٨م).
ابو الفداء، عمادالدين بن محمد بن عمر (ت٧٣٢هـ/١٣٣١م)
١٠- المختصر في أخبار البشر، المطبعة الحس ينية المصرية، (د.م، د.ت)
ابن العبري، غريغوريوس ابي الفرج الملطي (ت٦٨٥هـ/١٢٨٦م)
١١- تأريخ مختصر الدول، المطبعة الكاثوليكية، (بيروت: ١٩٥٨م).
ابن العديم، كمال الدين بن عمر بن أحمد بن أبي جرادة.
١٢- بغية الطلب في تأريخ الحلب، المحقق: د. سهيل زكار، طبعة الأولى، دار الفكر للنشر، (بيروت: ١٩٨٨م).
الماوردي، ابو الحسن محمد بن علي (ت٤٥٠هـ/١٠٥٨م)
١٣- الأحكام السلطانية و الولايات الدينية، دار الحرية للطباعة، (بغداد: ١٩٨٩م).
ياقوت الحموي، شهاب الدين بن عبدالله (ت٦٢٦هـ/١٢٢٩م)
١٤- معجم البلدان، دار صادر، (بيروت: د.ت).

سێیەم: سەرچاوە کوردییە نوێیەکان

حوسێن حوزنی موکریانی

١٥-بیرێکە ئێشکەوتن، چاپخانەی کوردستان، (هەولێر: ١٩٦٢).

مەلا خالید فریزی

١٦- پوختەیەك لە مێژوو کورد لە کۆنەوە تا ئێستا، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، (هەولێر: ٢٠٠٥م).

١٧- مێژووی کورد و کوردستان، وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان، (هەولێر: ٢٠٠٤ز).

صالح قەفتان

١٨- مێژووی نەتەوەی کورد، چاپخانەی (سلیمان الأعظمي)، (بەغداد: ب.س).

١٩-مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمرۆ، چاپخانەی ئۆفسێتی شڤان، چاپی سێیەم، (هەولێر: ٢٠٠٥).

عبدالرقیب یوسف

٢٠- دەوڵەتی دۆستەکی لە کوردستانی ناوەڕاستدا، وەرگێڕانی ابو بکر علی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، (هەولێر: ١٩٩٨ز).

محمد امین زکی

٢١-مێژووی کورد و کوردستان، چاپخانەی دار السلام، انتشارات سیدیان، (بغداد: ١٩٣١ز).

٢٢- خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، بەرگی یەکەم، (سلێمانی: ٢٠٠٤).

چوارەم سەرچاوە عەرەبییە نوێیەکان:
د. أحمد خليل
٢٣- تأريخ الكرد في الحضارة الاسلامية، دار هيدو للنشر و الطباعة، طبعة الأولى، (بيروت: ٢٠٠٧).
انور المائي
٢٤-الأكراد في بهدينان، مطبعة خبات، الطبعة الثانية، (دهوك: ١٩٩٩م).
بطرس البستاني
٢٥- دائرة المعارف، دار المعرفة، المجلد الخامس، (بيروت: د.ت).
سهيل زكار
٢٦- في التأريخ العباسي و الأندلسي السيسي و الحضاري، الطبعة الرابعة، مطبعة دار دمشق، (دمشق: ١٩٩١).
عبدالرقيب يوسف
٢٧- الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى،مطبعة اللواء، (بغداد: ١٩٧٢م).
٢٨- حضارة الدولة الدوستكية، مطبعة الحوادث، (بغداد: ١٩٧٥م).
فرست مرعي اسماعيل
٢٩- الإمارات الكردية في العصر العباسيالثاني، مطبعة وزارة التربية أربيل، طبعة الأولى، (أربيل: ٢٠٠٥م).
فيصل السامر
٣٠-الدولة الحمدانية في الموصل و الحلب، الطبعة الأولى، مطبعة الايمان، (بغداد: ١٩٧٠م).

د. كرفان محمد أحمد اميري

٣١- الكرد في كتابات ابن الاثير الجزري، مطبعة حجي هاشم، الطبعة الاولى، (اربيل: ٢٠٠٦م).

لازاريف و آخرون

٣٢- تأريخ كوردستان، ترجمة: د. عبدي حجي، طبعة الاولى، (أربيل: ٢٠٠٦م).

محمد أمين زكي

٣٣- تأريخ الدول و الامارات الكردية في الهعد الاسلامي، عربه و راجعه: محمد علي عوني، مطبعة السعادة، (مصر: ١٩٤٨).

٣٤- مشاهير الكرد و كردستان في الدور الاسلامي، ترجمة الى العربية: (كريمته)، مطبعة التفيض الأهلية، (بغداد: ١٩٤٥م).

پێنجەم: سەرچاوە فارسییە نوێیەکان

بابا مردوخ روحانی "شیوا"

٣٥- تأريخ مشاهير الكرد، چاپخانەی انتشارات سروش ليتوگراف، چاپ أول، (تهران: ١٣٧١م).

شەشەم: نامەکانی ماستێر

فائزة محمد عزت

٣٦- ٣٦- الكرد في اقليم الجزيرة و شهرزور في صدر الاسلام، دراسة في تأريخ السياسي، رسالة ماجستير مطبوعة بالآلة الكاتبة مقدمة الى مجلس كلية الآداب في جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩١م).

قادر محمد حسن

٣٧-الامارات الكردية في العهد البويهي، دراسة في علاقاتها السياسية و الاقتصادية، رسالة ماجستر مطبوعة بالآلة الكاتبة مقدمة الى مجلس كلية الآداب بجامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩٩م).

محمود ياسين التكريتي

٣٨-الامارات المروانية في دياربكر و الجزيرة، رسالة ماجستر مطبوعة بالآلة الكاتبة مقدمة الى مجلس كلية الآداب بجامعة بغداد، (بغداد: ١٩٧٠).

حەوتەم: گۆڤارەکان :

حەیدەر لەشکری

٣٩- دەسەڵاتی میری کوردستان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، گۆڤاری شانەدەر، ژمارە (٩)، وەرزە گۆڤارێکی زانستی یە، وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان، (هەولێر: ١٩٩٨ز).

قاد محمد ئەشکەنەیی

٤٠- ڕۆڵی لاوان لە پێکهێنانی دەسەڵاتی سیاسی کوردی لە سەدەکانی ناوەندا، گۆڤاری پێشکەوتن، ژمارە (١٤٧)، چاپخانەی منارە، (هەولێر: ٢٠٠٦).

# یەکێتی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨٧١

هۆشمەند عەلی مەحمود

دەستپێك: سەرەتایەکی کورت لە مێژووی ئەڵمانیا:

هەرچەندە ئەڵمانیا هەر لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە، وولاتێکی پارچەپارچەو لێکدابڕاوبووەو لەچەند میرنشین‌و دۆقێك پێك هاتبوو، هەروەها لەسەدەکانی پانزەو شانزەدا تیایدا بیروبۆچوون‌و تێکۆشان لەپێناو یەکێتی خۆیدا هاتۆتە ئاراوەو کاری بۆ کراوە، بەڵام دەبینین ئەم یەکگرتنە تا ساڵی ١٨٧١ نەهاتۆتەدی‌و بەئەنجام نەگەیشتووە.

لەڕاستیدا سەرەتای بوژاندنەوەو بەهێزبوونی ئەم بزووتنەوەیە زیاتر لەکاتی شاڵاوو داگیرکاریی ناپلیۆندا دەردەکەوێت، بەتایبەتی کاتێك هەڵسا بەداگیرکردنی خاکی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨٠٦دا، چونکە ئەمە وایکرد لەلایەك ببێتە هۆی بڵاوبوونەوەی بیروبۆچون‌و پرەنسیپەکانی شۆڕشی فەرەنسی‌و لەلایەکی دیکەشەوە سەرەتایەکی بۆ یەکێتی ئەڵمانیا لێکەوتەوە کە هەڵسا بەکەم کردنەوەی میرنشینە ئەڵمانیەکان لە (٣٠٠) میرنشینی لۆکاڵیەوە بۆ تەنها (٣٩) میرنشن، ئەوە جگەلەوەی کە ئەم داگیرکارییەی ناپلیۆن بوو بەهۆکارێکی گرنگ بۆ بڵاوبوونەوەی گیانی نەتەوایەتی‌و ڕەتکردنەوەی داگیرکاری‌و هەوڵدان بۆ دەرکردنیان لە وولاتدا.

بەمەش دەکرێت بڵێین کە ناپلیۆن و داگیرکارییەکانی ڕۆڵی بەرچاویانگێڕا لە بوژاندنەوەی بیری نەتەوەیی لە وڵاتانی دیکەی ئەورووپا لە دوای کۆنگرەی ڤیەننا.[١]

یەکەم: بزووتنەوەی نیشتیمانی ئەڵمانی ١٨١٥–١٨٤٨:

لە کۆنگرەی ڤیەننادا هیچ گرنگیەك بەهەستی نەتەوەیی گەلی ئەڵمان نەدراو بەهیچ شێوەیەکیش ئەم مەسەلەیە لەبەرچاو نەگیرا، هەرچەندە فۆن شتاین داوای ئەوەی کرد، کە ئەڵمانیا لەژێر سەرکردایەتی پروسیا یەکبخرێت، بەڵام ئەم داواکاریە لەلایەن مترنیخ و میرەکانی باشووری ئەڵمانیا، بەهیچ جۆرێك بەم بیرۆکەیە ڕازی نەبوون، ئەوەبوو بۆ دواجار لەم کۆنگرەیەدا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کە یەکێتییەك لە (٣٨) دەوڵەتۆکە بڕیاری لێدرا بەناوی دایت.[٢]

ئەم ئەنجومەنەی کە پێکهات لە نوێنەری حاکمەکان پێکهاتبوو، نەك لە نوێنەری گەل، وئەم کێشەیە لەلایەن نەمساوە سەرۆکایەتی دەکراو دەوڵەتۆکەکانیش لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیاندا ئازاد بوون، بەڵام بۆیان نەبوو لەگەڵ هیچ وڵاتێکدا ڕێککەوتن بکەن لەدژی ئەنجومەنی دایت، یان هەر وڵاتێکی ئەندام لە دایت، هەرچەندە ئەم دەوڵەتۆکانەی دایت بەشێوەیەکی ناڕاستەو خۆو تەنها بەناو لەژێر چاودێری دەوڵەتە زلهێزەکانی دیکەی ئەورووپادا بوون، کە پێکهاتەی یەکێتیەکەش هەریەك لە (هانۆڤەر– هۆڵشتاین– لۆکسمبرك)ی لە خۆدەگرت.[٣]

سەردەمی دوای کۆنگرەی ڤیەننا سەردەمی کۆنە پارێزیو گەڕانەوە بۆ سیستەمە کۆنەکانو گێڕانەوەی چەند میرێك بوو بۆ میرنشینەکەی، بەمەش سەردەمی ستەمکاری مەتەرنیخ دەستی پێکرد، بۆ دامرکاندنەوەو لەنێوبردنی هەرجۆرە بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی یان پێشکەوتن خوازانەی ئەوسەردەم، ئەم بارودۆخەش بوو بە هۆکاری بڵاوبوونەوەی بیری لیبراڵیو بیروڕا ئازادی خوازەکان، بەتایبەتی لەنێو توێژی ڕۆشنبیرانی ئەڵمانیاو فێرخوازانی زانکۆکانیان، بۆ پەرەسەندنی ئەم بیرەش لەوسەردەمدا چەند ڕێکخراوو یانەیەك دەرکەوتن، لەوانە (ڕێکخراوی لاوانی ئەڵمانیا).[٤]

سەرەتای دروست بوونی ئەم یانانەش لە زانکۆی یەناوە دەستی پێکرد بە نێوی (برشنشافت)و دروشمیشیان بریتی بوو لە: (شەرەف– ئازادی– نیشتمان).[٥]

لە ساڵی ١٨١٧دا لە فرتبرگ فێرخوازان هەڵسان بە سازدانی ئاهەنگێك بە بۆنەی تێپەڕبوونی چوار ساڵ بەسەر شۆڕشەکەی مارتن لۆسەرداو پاشان ئاهەنگەکە بوو بە خۆپیشاندانی جەماوەری لە دژی سیاسەتی کۆنەپارێزانەی مەتەرنیخ.[٦]

دواتر لە ساڵی ١٨١٩دا کارل ساند کە خوێندکارێکی زانکۆبوو هەڵسا بەکوشتنی (کۆتریبوی)، کە ڕۆمان نووسێکی کۆنە پارێز بوو، مەتەرنیخ یش ئەم ڕووداوەی بەهەل زانیو بڕیایدا کە لێرەوە چالاکی ئەم یانەو ڕێکخراوانە رابگرێتو داوای لە ئەنجومەنی دایت کرد، کە ڕێگە لەم جۆرە بزووتنەوانە بگرنو ئەم پێشنیارانەشی لەلایەن دایتەوە پەسندکرا، پاشان داواکاریەکانی

مەتـەرنیخ بـوون بـە بڕیارێـكو لـە مەرسـومی (کرلیـاد) دەرکـرانو دەسـت بەجێبەجێ کردنیان کرا.[٧]

بەم جۆرە ئەم بزووتنەوانە کپ کرانەوەو بەمەش دەبینین لـە مـاوەی نێوان ساڵانی ١٨١٩تـا ١٨٣٠ هـیچ جـۆرە بزووتنەوەیـەکی بەرچـاوی دیکـەی نەتەوایەتی ئەڵمانی بەدی ناکرێت، بەڵام بەڕای هەندێك نووسـەر وای دەبیـنن ئەم سەردەمە، سەردەمی خۆسازدان بێت بۆ یەکگرتن.[٨]

بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ساڵی ١٨٣٠ کۆمەڵێك شۆڕش لە وولاتـانی ئەورووپا بەرپاکران، لەوانە: (فەرەنسا– پۆڵەنـدا)و لەگـەڵ چـەند نێوچـەیەکی جیاجیای ئیتاڵیا، کە داواکاریەکانیان داواکاری نەتەوەییو لیبڕاڵی بـوو، هـەر لەوماوەیەشدابوو چەند نێوچەیەکی ئـەڵمانیاش ڕاپـەڕینی بەخۆیـەوە بینـیو بوو بە هۆکارێـك بـۆ بەدەست هێنـانی دەسـتوور لەچـەند نێوچـەیەکی وەك: (هەکاسل، برتزویك، هانۆڤـەر)، بـەڵام ئـەم بزووتنەوانـەش بوونـە هـۆی زیـاد بوونی سیاسەتی سەرکوتکردنو دامرکێندرانـەوە، بۆیـەش لەکۆتاییانـدا هـیچ جـۆرە دەرەنجـامێکی نێگـەتیڤی ئـەوتۆی لێنەکەوتـەوە لـە پێنـاو بـەر قەرارکردنی یەکێتی ئەڵمانیا.[٩]

هەرچەندە لەوسەردەمانەشدا بوو کە هیگڵ دەرکەوتو توانی ڕۆڵێکی باش لە گەلاڵەکردنی بیری نەتەوەیی ئەڵمان بگێڕێت.[١٠]

بـەم جـۆرە دەبیـنین لـەماوەی سـاڵانی دوای بەسـتنی کـۆنگرەی ڤییـەنناو پـشت گوێخـستنی مـافی نەتـەوەیی ئەڵمانـەکان، بـووە هـۆی گەشانەوەی زیاتری بزووتنەوەی ڕزگـاریخوازی ئـەڵمانی لـەدژی ستەمکاریو

سیاسەتی کۆنەپارێزی مەتەرنیخ و خەباتکردن و گرتنەبەری چەندین ڕێگای جۆراوجۆر بۆ گەیشتن بەئەنجام، بەڵام بەسوود وەرگرتن لەڕووداوەکانی ئەوروپا، هەربۆیەش دوای شکستی ۱۸۳۰، دەبینین لەساڵی ۱۸٤۰دا ڕاپەڕین جارێکی دیکە دەستی پێکردەوە.

دووەم: ڕووداوەکانی ساڵی ۱۸٤۸و کاریگەری بەسەر ئەڵمانیا:

لە ساڵی ۱۸٤۸دا چەند ڕووداوێك لەئەوروپا ڕوویاندا کە بوون بە هاندەرێك بۆ ڕاپەڕینەکانی هەمان ساڵ لە ئەڵمانیا، چونکە دوای ئەوەی لە فەرەنساو ئیتاڵیاو نەمسا چەند ڕاپەڕینێکی جیا جیا بەرپاکران و بوون بە هۆکارێك بۆ هەڵهاتنی مترنیخ، بەهەمان شێوە هەمان جۆر ڕووداوو دەربڕینی ناڕەزایی نیشتمان پەروەران لە شەقامەکانی بەرلین دەستیان پێکرد، بەڵام فردریك ولیەمی چوارەم هەوڵیدا کە بارودۆخەکە هێوربکاتەوە، ئەویش بەدانی بەڵێن و دانانی پلانێك بۆ یەکێتی ئەڵمانیا، سەرەتای هەنگاوەکانیشی بە دامەزراندنی وەزارەتی ئازادی و کۆمەڵەی دامەزراندن دەستی پێکرد.[11]

لە ۸ی ئازاری ۱۸٤۸دا نوێنەرانی گەلی ئەڵمانیا کە ژمارەیان (٦۰۰) کەس بوو، لە شاری فرانکفۆرت دەستیان بە کۆبوونەوەکرد، بەمەبەستی دانانی دەستورێکی ئازاد بۆ پروسیا،[12] کە گرنگترین ئەو خاڵانەی لەسەری ناکۆك بوون بریتی بوو لە کێشەی نەمسا، کە بۆماوەی ساڵێك کارەکانی دواخست، بۆیە هەندێك لەنوێنەران وایان پێ باش بوو نەمسا بەگشتی دەربکرێت، بەڵام هەندێکی دیکەیان دەیانویست نێوچە ئەڵمانیەکان لە نەمسا وەربگیرێتەوە. ئەوەبوو لە ساڵی ۱۸٤۹دا کۆتایی بەکارەکانیان هات و

دەستورێکیان دارشت، بەڵام ئەم جارەش کارەکانیان بێ ئەنجام مایەوە، چونکە فردریك ولیەمی چوارەم سەرکردایەتیەکەی رەتکردەوە.(١٣)

ئەم هەڵوێستە پاشگەزیەی فردریك لەوەوە سەرچاوەی گرتو کە لە نەمسا دەترسا شەڕ رابگەیەنێت لەدژی‌و پاشان روسیاش بەشداربێت، بۆیە بڕیاری پاشگەزبوونەوەیداو بەمەش هەوڵەکانی لیبراڵەکان بۆ لابردنی میرەکان‌و گەیشتن بەکۆماری شکستی هێنا.(١٤)

لەبەرئەوەی فردریك ولیەمی چوارەم بۆ دامرکاندنەوەی ئەو گیانی نەتەوایەتیەی کە لەبرەسەندن دابوو، بانگەوازی بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانێکی نوێ کرد، کە سەرجەم وولاتانی ئەڵمانیا بگرێتەوە تەنها نەمسا نەبێت، بەڵام ئەم هەوڵەش لەلایەن نەمساوە پوچەڵکرایەوە، چونکە داوای کرد ئەم هەوڵە رابگیرێت‌و کۆنفدراڵیە کۆنەکەی ساڵی ١٨١٥ی دایت بێتەوە، بەمەش پاشای پروسیا رەزامەندی خۆی دەربڕی‌و بەپێی هاوپەیمانیەتی (اولمیتز) گەڕایەوە بۆ ئەنجومەنی دایت ی ساڵی ١٨١٥.(١٥)

بۆیە دەبینین بزووتنەوەکانی ساڵی ١٨٤٨یش هەرچەندە گۆڕوتینێکی باش‌و کۆمەڵێك هەنگاوی باشی بۆ بەرەوپێش چوون تێدا بەدیدەکرا، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بەهەمان شێوەی رووداوەکانی ساڵانی پێشوو نەیتوانی مەبەستی سەرەکی خۆی بەدی بهێنێت، کە یەکێتی ئەڵمانیا بوو.

سێیەم: هەوڵەکان بۆ یەکێتی ئەڵمانیا ١٨٥٨-١٨٦٦:

لەکۆتایی پەنجاکانی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای شەستەکان لە ئەڵمانیا کۆمەڵێك ڕووداو ڕوویدا کە بایەخێکی زۆریان هەبوو، بەجۆرێك توانیان بارودۆخێکی نوێ بێننە ئاراوە.

یەکێك لەو ڕووداوە گرنگانە شێت بوونی فردریك ولیەمی چوارەم بوو لە ساڵی ١٨٥٨، کە براکەی ولیەمی یەکەم وەك جێگرەوەی (وصی) دەست نیشانکراو دوای ئەوەی پاشای شێت مرد لە ساڵی ١٨٦١، ولیەمی جێگرەوەی بوو بە پادشا. هەرچەندە پاشای نوێ بڕوای بە دەسەڵاتێکی کۆنەپارێزانەی ڕەها هەبوو، بەڵام کاریگەری دەوروبەرەکەی بەسەرەوە بوو کە لیبراڵی بوون بەتایبەتی کوڕەکەی خۆی، ئەمەش وایکرد لیبراڵەکان لەسەردەمی ئەودا زۆرترین دەنگ بەدەست بهێنن، کە دواتر ناکۆکی توندی لێکەوتەوە لەگەڵ پاشا.[١٦]

هەروەها گۆڕانێکی دیکەش کە گرنگ بوو، سیاسەتی پادشا ولیەمی یەکەم بوو، کە زۆر باوەڕی بە بەهێزکردنی سوپا هەبوو و هەوڵی بۆ یەکێتی ئەڵمانیا دەدا، بۆیەش لەسەردەمی ئەودا سوپا زۆر گەشەی کردو ژمارەیان لە (٤٠) هەزارەوە زیادی کرد بۆ (٦٠) هەزار سەرباز.[١٧]

جگە لەمانەش شکستی نەمسا بوو لە ساڵی ١٨٥٩ بەرامبەر بە فەرەنساو سەردینیاو بێ هێزبوونی بەشێوەیەکی بەرچاو.[١٨]

بەڵام لەهەموو ئەمانە گرنگتر سەرهەڵدانی ناکۆکی نێوخۆیی بوو لەساڵی ١٨٦١ لەنێوان پەرلەمانو پادشا لەسەر بودجەی سوپا، ئەمەش

بووە هۆی ئەوەی پادشا لەسەر ڕێنمایی وەزیری بەرگری (فۆن روت)، بسمارك بكات بەسەرۆك وەزیرانی پروسیا لە ساڵی ١٨٦٢دا.[١٩]

بەم هەنگاوو گۆڕانکاریانەش هەنگاوەکانی یەکێتی ئەڵمانیا دەستی پێکردو پروسیاش وەك وولاتێکی بەهێز دەربکەوێت، لەژێر کاریگەریو لێزانی سیاسیانەی بسمارك، چونکە دوای ئەوەی بسمارك دەسەلاتی گرتەدەست، هەنگاوەکانی یەکێتی ئەڵمانیای داڕشت بە لە نێوبردنو شکست پێهێنانی دوژمنانی پروسیا، بۆ ئەم مەبەستەشی چەند جەنگێکی سەربازی بەرپاکرد، وەك:

١- جەنگ لەگەڵ دانیمارك: یەکەمین جەنگی پروسیا لەگەڵ دانیمارك لەساڵی ١٨٦٤ دەستی پێکرد، دوای ئەوەی فردیکی حەوتەمی پاشای دانیمارك ویستی هەردوو دۆقیەی (سشلزڤیكو هۆلشتاین) بکاتە پارچەیەك لە وولاتەکەی، پاش خۆشی کاتێك کرستیانی دووەم بوو بە پاشا، دەستی بەسەر هەردوو دۆقیەکە داگرتو بەمەش جەنگ لەنێوان دانیمارك لەلایەكو نەمساو پروسیا لەلایەکی دیکە هەڵگیرساو ئەنجامەکەشی دانیمارك شکاو هەردوو دۆقیەکەی بەجێهێشت، کە بەشێوەیەکی کاتیو بەپێی پەیماننامەی (کاشتایت)، شلزڤیك بوو بە هی پروسیاو هۆلشتایت بۆ نەمسا.[٢٠]

٢- جەنگ لەگەڵ نەمسا: دوای سەرکەوتن بەسەر دانیمارك، بسمارك لەهەوڵی ئەوەدابوو گورزێکی سەربازی لە نەمسا بوەشێنێت، بەڵام بەر لەوەی هێرشی سەربازی دەست پێبکات، هەوڵی دا یارمەتی وولاتانی دیکە بۆ نەمسا ببڕێت، لەکاتێکدا بارودۆخەکەش بەشێوەیەکی سروشتی بەلای

بەرژەوەندی بسمارك دابوو، چونکە لەلایەکەوە پەیوەندیەکی باشو دروستی لەگەڵ بەریتانیا هەبوو بەهۆی یەکێتی زولفراینو سیاسەتی بازرگانی ئازادی پەیڕەودەکرد، لەلایەکی دیکەشەوە سەبارەت بە ڕوسیا دەبینین ئەویش لایەنگری پروسیا بوو، چونکە پێشتر پروسیا لایەنگری روسیای کردبوو لەجەنگی لەگەڵ پۆلەندا. بەلام بسمارك بۆ ڕاکێشانی پشتیوانی فەرەنسا بۆ وولاتەکەی، هەڵسا بەدانی چەند بەڵێنێکی شاراوە بە ناپلیۆنی سێیەمو بەمەش ڕەزامەندی فەرەنساشی بەدەست هێنا، بەهەمان شێوەش پشتیوانی ئیتاڵیاشی دەستەبەرکرد بەبەستنی پەیمانێك لەگەڵ سەردینیا لەدژی نەمسا، لەبەرامبەر وەرگرتنی ڤینیسیا.[٢١]

بسمارك دوای ئەم سەرکەوتنانەی لە سیاسەتی دەرەوەیی‌و دڵنیا بوون لە هەڵوێستی وولاتان بۆ پشتیوانی نەکردنی نەمسا، دەستی بەدەست تێوەردانکرد لە کاروباری هۆلشتایتو بەمەش لە ١٨ی حوزەیرانی ١٨٦٦ جەنگ دەستی پێکردو پروسیا قۆناغ بە قۆناغ بەرەو سەرکەوتن هەنگاوی دەنا، کە پاشان لە شەڕی (سادوا) بەتەواوی سەرکەوتو بەپێی پەیماننامەی پراگ، شەڕی نێوانیان کە ناسرابوو بە (شەڕی حەوت حەفتە) کۆتایی پێهات، بەپێی ڕێککەوتنی نێوانیشیان نەمسا دەستی لەسەر ڤینیسیا هەڵگرت بۆ ئیتاڵیاو دۆقیەکانی شلزڤیكو هۆلشتایت دران بە پروسیا، هەروەها یەکێتی دایتی ئەڵمانی هەڵوەشایەوەو نەمساش دانی نا بە یەکێتی میرنشینەکانی ئەڵمانیا لە باکور بە سەرۆکایەتی پاشای پروسیا.[٢٢]

ئەمەش بە گەورەترین سەرکەوتن دانرا بۆ ئەڵمانیەکان، چونکە سەرەتای یەکێتیەکەیان دەرکەوت لە باکوری ئەڵمانیا بە سەرۆکایەتی پروسیا، کە سەرجەم ویلایەتەکانی دەگرتەوە، تەنها ویلایەتەکانی (باڤاریا– وتمبرك– یادن) نەبێت لە باشوری ئەڵمانیا.(٢٣)

چوارەم: سەرکەوتن بەسەر فەرەنساو ڕاگەیاندنی یەکێتی ئەڵمانیا لە ١٨٧١:

دوای ئەو سەرکەوتنانەی پروسیا بەسەرکردایەتی بسمارك، قۆناغێکی نوێ لە هەنگاونان بەرەو یەکێتی ئەڵمانیا دەست پێدەکات، چونکە بسمارك لەهەوڵی بەهێزکردنی پەیوەندی بەهێزدابوو لەگەڵ ویلایەتەکانی دیکە لە باشووری ئەڵمانیا، کە مەبەستی سەرەکی ئەوەبوو تا ئەو ویلایەتانەش بێنێتە نێو یەکێتی ئەڵمانیا کە·لە باکوور پێکهاتبوو.

بۆیە بەردەوام ویلایەتەکانی باکوری لە ترس و هەڕەشەی فەرەنسا بۆ سەریان ئاگاداردەکردنەوە، هەرلەوکاتەشدا بوو ناپلیۆنی سێیەم داوای ئەو مافانەی دەکرد کە بسمارك لەپێش جەنگی دژ بە نەمسا بەڵێنی پێدابوو، بەڵام بسمارك ئامادە نەبوو بستێك زەوی بدات، بەپێچەوانەوە هەڕەشەکانی فەرەنسای لە بەرژەوەندی وولاتەکەی قۆستەوەو وایکرد ویلایەتەکانی باشوور بە نهێنی ڕێککەوتنی لەگەڵدا بکەن دژ بە فەرەنسا.(٢٤)

بەمەش بسمارك بەدوای هەڵدا دەگەڕا بۆ جەنگ لەگەڵ ئیسپانیا، کە لەوکاتەشدا هەواڵی ئەوە لە فەرەنسا بڵاوبووەوە کە یەکێك لە ئەندامەکانی بنەماڵەی (هوهتزلمرت) کە میری لیبوندە ڕازی بووە ببێت بە پاشای ئیسپانیا لەدوای ئەوەی بەهۆی مردنی پاشای ئەو وولاتە بۆشایی دروست

کردبوو، گوایە ئەم بە پادشایی بوونەی میری لیبوندیش دەستی بسمارکی تێدایە.[٢٥]

فەرەنسا بەم هەواڵە ناڕازیی بوو، هەڕەشەی کرد گەر ئەمە ببێت جەنگ لە دژی پروسیا ڕادەگەیەنێت، هەرچەندە سەرەتا ئەوەی نەکرد، بەڵکو هەڵسا بەناردنی سەفیری وڵاتەکەی بۆ لای پاشای پروسیاو چەند پرسیارێکی بەشێوەی گاڵتەجاری دەربارەی ئەم بابەتە ئاراستەکردو ئەویش بەهەمان شێوە وەڵامی دایەوە، ئەمەش بە هەڵەیەکی گەورەی فەرەنسا دادەنرێت، چونکە پسمارك ئەمەی قۆستەوەو بڵاوی کردەوە کە پاشای ئەڵمانیا سووکایەتی پێکراوەو لەهەمان کاتیشدا بە فەرەنسیەکانیشی ڕاگەیاند کە سفیرەکەیان سووکایەتی پێکراوە، هەرلەبەرئەوەش بوو فەرەنسا لە ١٤ی تەمموزی ١٨٧٠ جەنگی لەدژی پروسیا بەرپاکرد.[٢٦]

دوای جەنگێکی قورسو چەند جەنگێکی توند، لەئەنجامدا سوپای ئەڵمانیا لە جەنگی (سیدان) زۆر بەتوندی سوپای فەرەنسای تێکشکاندو ناپلیۆنی سێیەم تیایدا بە دیل گیرا، بەمەش پروسیا سەرکەوتو لە فەرەنساش بەهۆی شکستی ناپلیۆنی سێیەم حکومەتی بەرگری نیشتمانی دروستکرا، کە حکومەتی نوێ لە فرانکفۆرت پەیماننامەیەکیان لەگەڵ پروسیا مۆرکرد، بەمەش جەنگ لە ١٠ی مایسی ١٨٧١وەستاو بەپێی پەیماننامەی نێوانیشیان فەرەنسا دەستی لەسەر الزاسو لۆرینو متر هەلگرت بۆ پروسیاو سزای دارایی زۆریشی خرایە سەر.[٢٧]

بەم جۆرە شەڕی نێوان پروسیاو فەرەنسا کە لە مێـژوودا بـە شـەڕی (سـبعین) ناسـراوە کۆتـایی هـات، بـەڵام بـۆ ئـەڵمانیا دەرەنجـامی گـەورەی لێکەوتەوە، کە بـەهۆی ئـەم شـەڕەوە گیـانی نەتـەوەیی‌و نیشتمانی بەسـەر ویلایەتەکاندا زاڵ بوو، کاتێك کە توانیان ناکۆکیە نێوخۆییەکان بەلاوە بنـێن‌و یەکگرتن دروست بکەن‌و خـەونی یـەکێتی وڵات بهێننـەدی، بەتایبـەتی دوای ئـەوەی میرەکـان کـۆدەنگ بـوون لەسـەر ئـەوەی پاشـای پروسـیا (ولیـەمی یەکەم) بکەن بە ئیمپراتۆری وڵاتەکەیان، کە ئاهەنگێکیان سازکرد لـە هـۆڵی ئاوێنەکان لە کۆشکی ڤێرسای ڤییـەننا لـە بـەرواری ١٨ی کـانوونی دووەمـی ١٨٧١، بەمـــەش پرۆســـەی سیاســـیی یـــەکێتی ئـــەڵمانیا بەرجەســـتەبووو هاتــەبوون. ئــەڵمانیاش وەك وڵاتێکــی بــەهێز لــە ئــەوروپا بەدەرکــەوت، بەتایبەتی وەك ووتمان بە بەدەستهێنانی هـەردوو نێوچـەی ئـەلزاس‌و لـۆرین چالاکی ئابووری گەشەی کردو لەم ڕووەوە بەهێز دەرکەوت، کـە تـا کۆتـایی دەسەلاتی بسمارك ساڵی ١٨٩٠ لە پەرەسەندنی زیاتردابوو، بۆ ڕۆڵ بینین لـە سیاسەتی ئەوروپیدا.(٢٨)

## ئەنجام

بەنووسینی ئـەم بابەتـە گەیشتین بەچـەند ڕاسـتیەکی مێـژوویی سەبارەت بە ئەڵمانیاو پرۆسەی یەکێتیەکەی، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- ئـــەڵمانیا هـــەر لەســـەدەکانی ناوەڕاســـتەوە، وڵاتێکـــی پارچەپارچـــەو لێکدابڕاوبووەو لەچەند میرنشین‌و دۆقێك پێك هاتبوو، هەروەها لەسـەدەکانی

پانزەو شانزەدا تیایدا بیروبۆچوون‌و تێکۆشان لەپێناو یەکێتی خۆیدا هاتۆتە ئاراوەو کاری بۆ کراوە، بەلام دەبینین ئەم یەکگرتنە تا ساڵی ١٨٧١ نەهاتۆتەدی‌و بەئەنجام نەگەیشتووە.

٢- ناپلیۆن‌و داگیرکارییەکانی ڕۆڵی بەرچاویانگێڕا لە بوژاندنەوەی بیری نەتەوەیی لە ئەڵمانیا، چونکە ئەمە وایکرد لەلایەك ببێتە هۆی بڵاوبوونەوەی بیروبۆچون‌و پرەنسیپەکانی شۆڕشی فەرەنسی‌و لەلایەکی دیکەشەوە سەرەتایەکی بۆ یەکێتی ئەڵمانیا لێکەوتەوە، کە هەڵسا بەکەم کردنەوەی میرنشینە ئەڵمانیەکان لە (٣٠٠) میرنشینی لۆکالیەوە بۆ تەنها (٣٩) میرنشن، ئەوە جگە لەوەی ئەم داگیرکارییەی بوو بەهۆکارێکی گرنگ بۆ بڵاوبوونەوەی گیانی نەتەوایەتی‌و ڕەتکردنەوەی داگیرکاری‌و هەوڵدان بۆ دەرکردنی دوژمن لە وولاتدا.

٣- بزووتنەوەکانی ساڵانی ١٨٣٠و١٨٤٨ هەرچەندە گوڕوتینێکی باش‌و کۆمەڵێك هەنگاوی باشیان بۆ بەرەوپێش چوون تێدا بەدیدەکرا، بەلام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا نەیانتوانی مەبەستی سەرەکی خۆی بەدی بهێنێت، کە یەکێتی ئەڵمانیا بوو.

٤- شەڕی نێوان پروسیاو فەرەنسا بۆ ئەڵمانیا دەرەنجامی گەورەی لێکەوتەوە، کە بەهۆی ئەم شەڕەوە گیانی نەتەوەیی‌و نیشتمانی بەسەر ویلایەتەکاندا زاڵ بوو، کاتێك کە توانیان ناکۆکیە نێوخۆییەکان بەلاوە بنێن‌و یەکگرتن دروست بکەن‌و خەونی یەکێتی وولات بهێننەدی، بەتایبەتی دوای ئەوەی میرەکان کۆدەنگ بوون لەسەر ئەوەی پاشای پروسیا (ولیەمی

یەکەم) بکەن بە ئیمپراتۆری وولاتەکەیان، کە ئاهەنگێکیان سازکرد لـە هـۆڵی ئاوێنەکان لە کۆشکی ڤێرسای ڤییـەننا لـە بـەرواری ١٨ی کـانوونی دووەمـی ١٨٧١، بەمـــەش پرۆســـەی سیاســیی یــەکێتی ئــەڵمانیا بەرجەســتەبوور هاتەبوون.

٥- بسمارك ڕۆڵی دیـارو بـەرزی بینـی لـە سـەرکەوتن‌و گەیشتن بـە ئامـانج، چونکە دوای ئەوەی دەسەلاتی گرتەدەست‌و بو بەسەرۆك وەزیرانـی پروسـیا لە ساڵی ١٨٦٢دا، هەنگاوەکانی یەکێتی ئەڵمانیا دەستی پێکردو پروسـیاش وەك وولاتێکـی بـەهێز دەرکـەوت، لـەژێر کاریگـەری‌و لێزانـی سیاسـیانەی هەنگاوەکانی یەکێتی ئەڵمانیای دارشت بـە لـە نێـوبردن‌و شکست پێهێنـانی دوژمنانی پروسیا، بۆ ئەم مەبەستەشی چەند جەنگێکی سەربازی بـەرپاکرد، لەگەڵ هەریەکە لە (دانیمارك‌و نەمساو فەرەنسا).

## پەراوێزو سەرچاوەکان:

[1] أحمد خاكي: فلسفة القومية، دار المعارف بمصر، القاهرة، بدون سنة الطبع، ص١٠٨.

[2] خليل على مراد واخرون: دراسات فى التاريخ الاوربى الحديث والمعاصر، من مطبوعات وزارة التعليم العالى والبحث العلمى، جامعة موصل، ١٩٨٨، ص١٩٧.

[3] فاضل حسين و كاظم هاشم نعمة: التاريخ الاوربى الحديث، ط١، من مطبوعات وزارة التعليم العالى والبحث العلمى، جامعة موصل، ١٩٨٢، ص٢١.

[4] محمد محمد صالح وأخرون: تاريخ اوربا فى القرن التاسع عشر، من مطبوعات وزارة التعليم العالى والبحث العلمى، جامعة بغداد، ١٩٨٥، ص١٣٩.

[5] خليل على مراد واخرون: م.س، ص١٩٨.

[6] ن.م، ص١٩٨.

[7] محمد محمد صالح وأخرون: م.س، ص١٤٠.

[8] هـ.ا.ل.فشر: تاريخ اوربا فى العصر الحديث (١٧٨٩–١٩٥٠)، ت.احمد نجيب هاشم و وديع الطبع، دار المعارف بمصر، بدون سنة الطبع، ص٢٠٣.

[9] عبدالكريم احمد: القومية والمذاهب السياسية، الهيئة المصرية العامة للتأليف والنشر، ١٩٧٠، ص٢٣٩.

[10] هـ.ا.ل.فشر: م.س، ص٢٠٣.

[11] خليل على مراد واخرون: م.س، ص٢٠٢.

[12] على حيدر سليمان: تأريخ الحضارة الاوروبية الحديثة، ط١، بغداد، ١٩٩٠، ص٢٣٩.

[13] عبدالكريم احمد: م.س، ص٢٣٨.

[14] ن.م، ص٢٤١.

[15] ن.م، ص٢٤٢.

[16] ن.م، ص٢٤٣.

[17] خليل على مراد ولخرون: م.س، ص٢٠٤.

(18) ن.م، ص٢٠٣.

(19) محمد محمد صالح وأخرون: م.س، ص١٤٦.

(20) خليل على مراد واخرون: م.س، ص٢٠٧.

(21) محمد محمد صالح وأخرون: م.س، ص١٤٦.

(22) ن.م، ص١٥١.

(23) على حيدر سليمان: م.س، ص٢٤٦.

(24) خليل على مراد واخرون: م.س، ص٢١٠.

(25) ه.ا.ل.فشر: م.س، ص٢٨٦.

(26) خليل على مراد واخرون: م.س، ص٢١١.

(27) محمد محمد صالح وأخرون: م.س، ص١٥٦.

(28) ن.م، ص١٥٧.

# گەشەکردنی بزوتنەوەی نیشتمانی لە ئێران

پاری دووەم

پارتە سیاسیەکان

(بەشی چوارەم)

و. لە عەرەبییەوە: محەمەد عەبدوڵا کاکەسوور

هاتنە ناوەوەی هێزەکانی ئەنگلۆ- سۆڤیەتی بۆ ئێران لە ساڵی ١٩٤١، و ناچار کردنی ڕەزا شا بە دەستهەڵگرتن لە تەخت بۆ کوڕەکەی محەمەد عەلی ڕەزا پەهلەوی و کەوتنی دیکتاتۆرییەتە خۆ سەپێنەکەی بارودۆخێکی نوێ و کەش و هەوایەکی لواوی بۆ پێکهێنانی ڕەوت و پارتە سیاسیەکان خوڵقاند. تیبینی ئەوە دەکرێت کە نووسەرە بۆرژوازییەکان هەمیشە ئەوە دووپات دەکەنەوە کە پارتی سیاسی تەواو لە ئێراندا نەبوو بەڵکو کۆبوونەوە و ڕەوت هەبوون. ئەمەش وەکو هەوڵێك بۆ شاردنەوەی خەباتی جەماوەری ئێرانی بەسەرکردایەتی پارتە نیشتمانی و پێشکەوتنخوازەکانی. هەر بۆ نموونە نووسەر جۆن مارلو دەڵێ "ئەو سیمایەی ئێرانی پێ جیادەکرێتەوە ئەوەیە کە ئەو بزوتنەوە نیشتمانییەی گەشەی کرد نەك وەك بزوتنەوەیەکی بەرەنگاربوونەوەدژی هێزەکانی داگیرکەر، و نە لە چوارچێوەی پارتێکی سیاسی یەکگرتوو. بەڵکو زیاتر بە پێگەیشتنی پلە بە پلەی تاکەکان دەچێت، کە پەرەسەندن لە نێوانیاندا بە شێوەیەکی نا ئارەزوو مەندانە بەبێ

ڕێکخستن، یان بە بێ بەرنامەیەکی سیاسی تەنانەت بەبێ ئەو زانینە گشتییە بە پێویستی ئەنجامدانی چاکسازی کۆمەڵایەتی کە هێز وچوونە ناو یەکتری چەندین بزوتنەوەی نیشتمانی سەرکردایەتی کەر"[1].

هەرچی نووسەری ئەمریکی جۆرزێف ئەبتن دەڵێ: سەرەڕای ئەمەش لەماوەیەکی درێژەوە پارتی سیاسی لەسەر ئاستی وڵات نەبوو کە بتوانێ ئەم بنەمایە بۆ مەشقپێکردنی فەراهەم بکات. پێویستەکانی هەبوو بۆئەوەی بە پارتە سیاسیە ئامادەبووەکان وەکو دابێك بۆ هەڵبژاردنەکان ناو دەبرێ بەڵام بە دەراوتنی پارتی تودە کە شیوعییەکان کۆنترۆڵیان کردبوو..."[2].

تێبینی ئەوەش دەکرێ کە لەوکاتەی نووسەری ئینگلیزی مارلو بوونی پارتی بە ببڕای بڕای ڕەتدەکردەوە ئەوە دەبینین ئەبتن دان بە بوونی پارتی تودە دەنێ، بەڵام بوونی پارتی سیاسی لەو ماوەیەدا لەسەر ئاستی وڵات لە ماوەیەکی درێژەوە ڕەت دەکاتەوە" ئەمەش شێواندانە بۆ مێژووی بزوتنەوەی نیشتمانی ئێرانی، ئەوەبوو پارتی عەدالەی ئیشتراکی لە کۆمەڵێك لە شیوعی و دیموکراتی ئێرانی پێکهات، ئەوانەی کە لە ساڵی ١٩١٦ لە شاری باکۆی ڕووسی کاریان دەکرد، ئینجا لە ساڵێ ١٩٢٠ پارتی شیوعی ئێرانی دامەزرا و تەنانەت دوای ئەوەی لە سییەکان و لە ئەنجامی کۆنترۆڵکردنی دیکتاتۆریەتی قێزەونی ڕەزا شا نەما هەر لە کارکردنندا بەردەوام بوو. بزوتنەوەی نیشتمانی سیاسی ئێرانی بە بوێری خەباتی کرد دژی هەموو شێوەکانی خۆسەپاندنی ئیستیعماری ئەمەش لە چوارچێوەی پارتە نیشتمانی و پێشکەوتنخوازەکان بوو. ئینجا جورزێف ئەبنت دەڵێ: "سەرەڕای

گرنگی پێدانی ڕوون بە سیاسەت لەنێوان دانیشتوانی شارەکاندا و بەتایبەت لە تاران، سەرهەڵدان و دەرکەوتنی پارتە سیاسییە چالاکەکان تاکو کاتی ئێستا هەولێکی سەرنەکەوتوو بوو، لەوانەشە لەبەر سێ هۆ کە ئەمانەن: نەبوونی پاڵنەر و تێگەیشتن و هاوکاریکردن.

یەکەمین: ئەگەر سیسەمی هەڵبژاردن بە هەند هەڵبگرین ئەوە تەنها متمانەیەکی کەم هەبوو بەشێوەیەك کە تەنانەت ئەو پارتەش کە بەشێوەیەکی باش و فراوان بەشێوەیەکی ڕێژەیی ڕێکخرابوو نەیدەتوانی دەنگی چالاك لە ئەنجومەن بەدەست بهێنێت.

دووەم: تا ئەگەر مەبەست و ئامرازەکانی ڕێکخراوی پارتی سیاسی ڕوون بێت ئەوە لەوانەیە خۆبەخش نەبن بۆ جێبەجێکردنی کردەوە و ئەرکەکانی پارت کە بۆماوەیەك بەشێوەیەك کە لەوانەبێ ببێتە مایەی ئەنجامی بەرهەمدار.

سێیەم: ئەو تاکڕەوییەی کە فارسەکان پێی دەناسرێنەوە، ئەویش ئەو سیفەتەیە کە زیاتر سەروەرە فارسەکان بە توندی بەرگری لێدەکەن وادەکات کە ڕێکخستنی کارا زۆر زەحمەت بێ ئەوە ئەگەر موستەحیل نەبێ. لەوانەیەهۆشیاربوون بەو سیما نەتەوەییە تاکڕەوییە زاڵە بەشداری کردووە لەو ڕاستییەی کە دەڵێ پارتی سیاسی مۆڵەت پێدراو لەلایەن ڕەزا شاوە نەبوو"[٢١١].

ئەو شیکردنەوەیەی نووسەری ئەمریکی جۆزێف ئابتن پێشکەشی کردبوو بۆ پاساوهێنانەوە بۆ نەبوونی پارتی سیاسی سەرکردەی بزووتنەوەی نیشتمانی ئێرانی زۆر دوورە لە زانستیبوون، وەکو زانراوە پارتە

پێشکەوتنخوازەکان و لەسەرو هەمووشیانەوە پارتی شیوعی ئێرانی و لەدوای ئەوەش پارتی تودە و پارتی "بەرەی نیشتمانی" کە دکتۆر موسەدەق سەرکردایەتی کرد ڕۆڵی سەرەکی بنەڕەتیان بینی لە گەشەکردن و پێگەیاندنی بزوتنەوەی نیشتمانی لە ئێراندا، بوونی پارت و کۆمەڵە سیاسییە پێشکەوتنخوازەکانی ئێستاکە کە خەبات دەکەن دژی فەرمانڕەوایی بەکرێگیراوی ژێر دەستی دەسەڵاتی ئەنگلۆ ئەمریکی باشترین بەڵگەیە کە بیهێنینەوە لەسەر هەڵەبوونی ڕای بۆرژوازی و ئامانجەگەی شێواندنی بزوتنەوەی نیشتمانی ئێرانی.

گەشەکردنی بزوتنەوەی شیوعی:

لە پێشتر باسمان کرد کە زۆربەی ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی و ئەندامە دیارەکان لە پارتی شیوعی ئێرانی لە ماوەی ساڵانی ١٩٢٩- ١٩٣٢ لەژێر سێبەری دیکتاتۆرییەتی ڕەزا پەهلەویدا گیران، بەتایبەتی کە توانیان لایەنگیری چەند بەشێکی زۆر لەگەل بە دەست بێهێنن، شا بە دوژمنی یەکەمی دادەنان کە دەبوایە لەناو ببردرێن بەڵام دوای لابردنی ڕەزاشا لەسەر تەخت و گرتنە دەستی تەخت لەلایەن کوڕەکەیەوە هەموو بەندییە سیاسییەکان ئازادکران و لە سی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ پارتی تودە (گەل) لەسەر دەستی پیاوانی دکتۆر تەقی ئارانی دامەزرا، ئەو کەسەی کە لە بەندیخانەدا لەگەڵ ژمارەیەکی بچووك لە شیوعییەکان تاوانبار کران و کوژران، ئەوانیش ئەسکەندەری، و عەباس میرزا و سلێمان موحسین و ئیراج بوون. دکتۆر ڕەزا رامدنیش، و دکتۆر مورەز یەزدی و دکتۆر فەرەیدون

کیشاو ئـەرتز، و عـەلی بـورزورگ عەلـەوی، و دکتـۆر محەمـەد بـەحرامی مەنەزیری مارکی پارتی نوێ، بوونە ئەندامی مەرکەزۆ لیژنـەی پـارتی نـوێ. بـەکارهێنانی پـارتی (تـودە)ش لـەجێی (پـارتی شـیوعی ئێرانـی) ئامـانجی ڕاکێشانی هـەموو چینە چەوساوەکانی هـەبوو لـە کرێکـاران و جووتیـاران و قوتابیـان و کاسبکاران و ڕۆشـنبیران و عەسـکەرییە شۆڕشـگێڕەکان، پارتـە نوێیەکـەش دروشمـەکانی ڕووتـی شـیوعی کرێکـاری بەرزنـەکردەوە بـەڵکو بەرنامەیـەکی گـشتی لیبراڵـی خـستەڕوو، زۆر لـە ئێرانییـەکان کـە دژایـەتی دەسەڵاتی کۆنـە پەرستییان دەکـرد کـە خـۆی لـە شـا و دار و دەسـتەکەیدا دەبینییەوە پشتگیری بەرنامـەی پارتەکـەیان کـرد. لەماوەیـەکی کورتـدا ئـەو پارتـە تـوانی کـە متمانـە و پـشتگیری توێـژێکی زۆر لـە کرێکـاران بەدەسـت بهێنێـت، و دەسـتی کـرد بـە ڕێکخـستنی سـەندیکا کرێکارییـەکان، ڕەزا شـا یەکـەمین کـەس بـوو کـە سـەرکردایەتی ئەنجومـەنی مەرکـەزی سـەندیکا کرێکارییەکانی ئێرانی کرد، کە لە ١ی ئایاری ١٩٤٣دامەزرا، ئەمینداری نهێنی گشتیش ڕەزا ڕۆسا یەکێك لە دامەزرێنەرە دیارەکانی پـارتی تـودە بـوو، لـە ساڵی ١٩٤٤ بوو بەئەندام لە لیژنەی دووەمی سەرپەرشتیکار لەسەر پارت، لە سـاڵی ١٩٤٥ ئەنجومـەنی مەرکـەزی سـەندیکاکانی کرێکـاران بـە یـەکێتی کرێکارانی دیموکراتی جیهانی بەستراوە ، لە ماوەی ساڵە یەکەمینە کەمەکان لە تەمەنیدا قەڵەمڕەوی پارتی تودە (گەل) مەزن بـوو، ئـەوەبوو نزیکـەی نیـو ملیـۆن هـاوڵاتی بەشـدارییان لـەو کۆبوونـەوە و خۆپیـشاندانانەدا کـرد، کـە پارتەکە لە پاییزی سـاڵی ١٩٤٤ ڕێکـی خـست. سـەرەڕای بـەرەنگاری قـووڵ

لەلایەن کۆنەپەرستی و کۆمپانیای پەترۆڵی ئەنگلۆ- ئێرانی، بزوتنەوەی دیموکراتی لە ناوچەکانی پەترۆڵ لە ئێراندا بڵاو بووەوە. لە یەکی ئایاری ١٩٤٥ (٨٠) هەزار لە کرێکارانی پەترۆڵ ڕژانە سەر شەقامەکان و ڕۆژی لەگەڵ یەکتربوونی جیهانیان لەنێوان کرێکاراندا کردە ڕۆژی خەبات کردن دژی کۆلۆنیکەران. و لە سی ئایاری هەمان ساڵدا یەکەمین مانگرتنی گەورەی کرێکارانی کۆمپانیای پەترۆڵی ئەنگلۆ- ئێرانی لە کرماشانەوە دەستی پێکرد، ئەوبوو (٩٥٠) کرێکار بۆ ماوەی شەش ڕۆژ مانیان گرت.

لەدوای شەڕی دووەمی جیهانی و ڕوودانی گۆڕان لە بارودۆخی نێودەوڵەتی لە بەرژەوەندی هێزە پێشکەوتووەکان و نیشتمانییەکان، ئەوە بزووتنەوەی نیشتمانی لە ئێران زۆر فراوان و قووڵ بووەوە. بەڵام لەلایەکی ترەوە دەستێوەردانی ئەنگلۆ- ئەمریکان لە بارودۆخی ناوخۆی وواڵتدا توند بوو. لە حوزەرانی ساڵی ١٩٤٥ بارودۆخی نائاسایی لە ئەسفەهان ڕاگەیەندرا، و دەوروبەری (٢٠٠) لە ئەندامانی پارتی تودە گیران، هێزە سەربازییەکانیش یانەکانی پارت و بارەگاکانی سەندیکاکانی داگیرکرد، لە ئەیلولی هەمان ساڵیش بارودۆرخی نا ئاسایی سەپێندرا سەدان کەس لە لایەنگرانی بزووتنەوەی دیموکراتی گیران. پارتەکە بە ڕاشکاوی و ئاشکرایی پشتگیری لە شۆڕشگێڕانی ئازەربیجانی کرد، لە ماوەی ساڵی ١٩٤٦ ڕەوتی مانگرتنەکانی عەبادان و ئاغاجاری و ناوچە پترۆڵییە ستراتیژییەکانی تری لە عەرەبستان گرتەوە، لە یازدەی ئایاری ساڵی ١٩٤٦ دە هەزار کرێکاری پترۆڵ مانیان گرت. لەدوای هەفتەیەك (١٥٠٠) لە کرێکارانی وێستگەکانی بەنزین لە تاران

بەدوایاندا هاتن، و لە ١٤ی تەموزی هەمان ساڵدا مانگرتنی گشتی لە دام و دەزگاکانی کۆمپانیای پترۆڵی ئەنگلۆ- ئێرانی دەستی پێکرد وەکو نارەزایی دەبرین لەسەر دەست تێوەردانی مۆنۆپۆلییە پترۆڵییە بەریتانییەکان لە کاروباری ناوخۆی ئێران، ئەم مانگرتنەش جەماوەری بە کۆمەڵ بوو، و هەموو کرێکارەکان و بەردەستەکانی گرتەوە و ژمارەیان گەیشتە نزیکەی سەد هەزار مانگرتوو، کەچی ئینگلیز و بەکرێگیراوەکانیان هەندێ شێخە کۆنەپەرستەکانی هۆزەکان تەشقەڵە پێکردنێکی خوێناویان رێکخست بە جۆرێك کە هۆزەکان هێرشێکی چەکدارییان رێکخست دژی مانگرتووان و بووە مایەی کوشتنی ٤٧ کەس و برینداربوونی ١٧٣ کەسی تر، و ئیفیل ساتۆن لە کتێبەکەی پترۆڵی ئێرانی سەبارەت بە گرنگی ئەو مانگرتنی نووسی : "مانگرتنی گشتی لە تەمووزی ساڵی ١٩٤٦ لێدانێکی توندی ئاراستەی کۆمپانیاکە کردبۆ یەکەمجار دەستی بەوە کرد کە تێبگات تا چ رادەیەك مایەی رقلێبوونەوەیە لە وولاتدا بارودۆخەکاشەی چەند مەرتسیدار و تەنگاوە"[٤].

پارتەکە سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەوەی کە سێ لە ئەندامەکانی چوونە ئەو وەزارەتە ئێرانییەی کە لەو کاتەدا قەوام ئەلسەڵتەنە سەرکردیەتی دەکرد، لە هەندێ سەرچاوەشدا هاتووە کە پارتی تودە تەنها بە دوو وەزیر بەشدای تێدا کردووە یەکێکیان ئایرج ئەسکەندەری ئەوەی کە لە دواییدا بە سکرتێری گشتی پارتەکە دانرا لە جێگای رەزا رادمنش[٥]. هەندێك وای دەبینن کە بەشداریکرنی پارتەکە لە حکومەتی قەوام ئەلستەڵتەنە یەکێك لەو

هۆیانەوە بوو کە بووە هۆی ئەوەی سوپای ئێرانی ڕژێمی دیموکراتی لە هەردوو کۆماری ئازەربیجان و مەهابادی کوردی بڕوخێنێ، لە کاتێکدا هەندێکی تر وای دەبینن کە سەرکەوتنێکی گەورەبوو بۆ پارتەکە. لە دووی ئابی ١٩٤٦ قەوام ئەلسەڵتەنەوە وەزارەتەکەی خۆی کۆتایی پێهێنا، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو مانگرتن و پەشێویانەی پارتی تودە لەگەڵ موزەفەر فەیروز وەکو لایەنگرێکی تودە هاتنە ناو وەزارەت ئەوەی دواییان بە سیفەتی جێگری سەرۆك وەزیران سەبارەت بە ڕێکەوتننامەی ئازەربیجان گفتوگۆی کردبوو. وا بەدیارکەوت وەکو ئەوەی ئێران، لە ئەنجامی هەڵنەستانی بەریتانیا یان وولایەتە یەککگرتووەکان بە هەر کارێك، بەشێوەیەکی پلە پلەیی لەدوای ئەو شتە خۆی بزردەکرد کە پێی دەووترا پەردەی ئاسنین. ڕاگەیاندنی وەزارەتە نوێکە بووە مایەی کاردانەوەیەکی بەریتانی چاوەڕواننەکراو، ئەوەبوو هێزەکنی بەریتانی لە بەسرە دابەزین ..."[٦] و هێزە کۆنەپەرست و ئیستیعمارییەکان دەستیان بە کارکردنی خێرا کردبوو بۆ لێدانی ئەو سەرکەوتنەی پارتی تودە بەدەستی هێنا، یەکێتییەك لە نێوان بەختیارییەکان و قەشقایی و هەندێ هۆزی تر لە باشووری ئێران ڕوویدا، بێگومان بە هاندانی بەریتانیا، و هەڵگەڕانەوەیان دژی حکومەتی قەوام ئەلسەڵتەنە ڕاگەیاند، و داوای دەرکردنی وەزیرەکانی پارتی (تودە)یان کرد. هەڵگەڕاوەکان دەستیان گرت بەسەر بوشیر و کازرون و شاری تر، و شیرازیان ئابلۆقەدا. لەدوای ئەوەی حکومەت شکاتێکی شکڵی دژی دەستتێوەردانی بەریتانیا پێشکەش کرد، قوام ئەلسەڵتەنەی ناچارکرد کە مامەڵە بکات لەگەڵ

ناسرخان قشقایی سەرکردەی هەڵگەڕاوەکان لەسەر داوایەکەی ڕازی بێت بە دەرکردنی موزەفەر فەیروز وەزیری شیوعییەکان لە حکومەت"[٧١]، و بە دواکەوتن و ڕاوەدونانی پارتی تودە و لایەنگرایەن بەردەوام بوو، لەدوای مانگێکیش لە چوونە دەرەوەی وەزیرە شیوعییەکان لە تشرینی دووەم حکومەتی بەکرێگیراوی ئێرانی و بە پشتگیریکردن لە هێزە بەریتانییەکان هەواڵگرییەکانەوە دەستی کرد بە لێدانی کوشندە بۆ ۆماری دیموکرات ئازەربیجان.

ساڵی ١٩٤٧ ئەو ئەنجوومەنە مەرکەزییەی سەندیکاکانی کرێکاران هەڵوەشایەوە کە پارتی تودە کۆنترۆڵیان کردبوو، و دوو ڕێکخراو سەرکردایەتی بزووتنەوەی کرێکارییان لەنێوان خۆیاندا بەشکرد کە مونافسی یەکتربوون، ئەوانیش بریتی بوون لە یەکێتی فیدراڵی و سەندیکای کرێکارانی ئێرانی. سەرلەنوێ کارکردن لە عبادان و لە کێڵگەکان دەستی پێکرد کاتێك دوو ڕێکخراوی سەر بە حکومەت دەستیان کرد بە کارکردن بۆ ڕاکێشانی کرێکاران و وەستانەوە لەڕووی ڕێکخراوە کرێکارییەکانی پارتی تودە، ئەو دوو ڕێکخراوەش یەکێتی کرێکارانی عەرەبستان و یەکێتی کرێکارانی پترۆڵ بوون، و لە ساڵی ١٩٤٩ کرێکارانی چێشتخانەکان مانگرتنێکی بچووکی ڕێکخراوییان لە عبادان ڕێکخست بە مەبەستی بەرزکردنەوەی کرێیەکانیان، بەبێ دواخستن چارەسەرکرا. مانگرتنێکی تری لە تشرینی یەکەم بەدواداهات لە بەرژەوەندی پاڵێوراوێك لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی، سەرەڕای پاڵنەرە سیاسییەکانیش، هیچ شوێنەوارێکی قەڵەمڕەوی شیوعی لەم مانگرتنەدا

نەبوو، و هەروەها ماوەی کورت بوو، و لەماوەی حەفدە مانگەکەی تردا مانگرتنی کرێکاری ڕووی نەدا[8]، حکومەتی بەکرێگیراو و بەڕێوەبەرایەتییە ئیستیعمارییە بێگانەکان ویستیان لێدانێکی بەهێز ئاراستەی هێزە پێشکەوتنخوازە نیشتمانییەکان بکەن لەسەرووشیانەوە پارتی تودە کە بەوە تۆمەتبار کرا کە لەدوای هەوڵی کوشتنی شاوە بووە لە چواری شوباتی ساڵی ١٩٤٩. "لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ پلانەکانی شاری بەشێوەیەکی نا مەبەستدار ئاسان کرد، دوای پلان دانان بۆ هەوڵێکی سەرنەکەوتووی کوشتنی شا. ئەم هەوڵە بووە هۆی کاردانەوەیەکی میللی کاتی دژی هەریەکە لە دوو گروپە توندڕەوەکە و لە بەرژەوەندی شا و میانڕەوەکانی، تاوانەکەش بەشێوەیەکی فەرمی خرایە ئەستۆی ئەندامێك لە پارتی تودە – لەگەڵ ئەوەی کە تاوانەکە بەڕاستی لەسەر دەستی ڕۆژنامەنووسێك ئەنجامدرابوو کە لەژێر کاریکەری یەکێك لە گروپە ئاینییە ڕاستڕەوەکان بوو– لە ئەنجامی ئەمەش پارتی تودە قەدەغەکرا، چەندین سەرکردەی پارتەکە گیران .."[9].

هەموو نوسەرە بۆرژوزییەکان لەنێوانیاندا جۆن مارلو وای دادەنێن کە گروپی شا و کۆشکی ئیمپراتۆری و گەورە موڵکدارانی زەوی و گەورە بازرگانان، باڵێ ناوەڕاست دەنوێنن، لەکاتێکدا کە موسەدەق و پیاوانی باڵی ڕاستڕەوییان دەنواند..! بەم شێوەش تێبینی ئەوە دەکەین کە مەبەستی لە "هەردوو گرووپە توند ڕەوەکە" هەریەکە لە پارتی تودە و موسەدەق و پیاوانییەتی. بەم شێوەیەش حکومەتی بەکرێگیراو هەلی گونجاوی بۆ خۆی دروستکرد بۆئەوەی بەشێوەیەکی توند هەڵکوتێتە سەر لایەنگران و

ئەندامانی پارتی تودە کە لە رۆژی پێنجی شوبات قەدەغە کرا. پارتەکەش ناچار بوو کە بە نهێنی کاربکات، سەرەڕای ئەو سەرکەوتنانەش کە گروپی بەرەی نیشتمانی بەسەرکردایەتی دکتۆر موسەدەق بەدی هێنا، ئەوەش ئەو حکومەتانەی لەدوایدا هاتن بەردەوام بوون لەسەر ڕاوەدوونانی شیوعییەکان، لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩٥٠ دەیەها کەسیان لێ گرتن لەدوای ئەوەی سەدەها بڵاوکراوە لە شەقامەکاندا بڵاو کرانەوە کە تیایاندا هێرش دەکرایە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا، و پارت لەسەر چوار بابەت چڕ بووەوە کە ئەمانەن:

- ڕۆڵی شا لە حکومەتدا.
- ڕازیبوون یان ڕەتکردنەوەی ڕێککەوتنامەی پترۆڵ.
- ڕازیبوون یان ڕەتکردنەوەی یارمەتی سەربازی ئەمریکی.
- ڕازیبوون یان ڕەتکردنەوەی زنجیرە کوبوونەوەکانی سۆڤییەتی سەبارەت بە وەرگرتنی یارمەتی سەربازی ئەمریکی، ئەوەی کە بە بەزاندنی وابەستەبوونی ڕێکەوتنامەی ئێرانی، و چالاکیەکانی ئەمریکی پترۆڵ بوو لە ئێران دادەنرێ.

خرماڵی کردنی پیشەسازی پترۆڵی ئێرانی لە یازدەی ئایاری ١٩٥١ هەلی ڕەخساند بۆ پارتی تودە تاکو ڕادەی توانای خۆی لە جولانەوە و ڕووبەڕووبوونەوەی هێزە ئیستیعمارییەکان بۆ جەماوەری ئێرانی ئاشکرابکات، پارتەکە داوای مانگرتنێکی گشتی لە عەرەبستاندا کرد، کرێکارەکان وەکو دەنگ خستنە پاڵێك لە یەکێك لە کێڵگەکان مانیان گرت

وەکو ناڕازی دەربڕینێك دژی ئەم کەمکردنەوەی کۆمپانیایە کە لە یەکێك لە وێستگکانی ئەنجامیدا، مانگرتنەکەش هەر تەنها بۆ کێڵگەکانی تر لە عبادان بڵاو نەبۆوە، بەڵکو لە دوازدەی نیسان بووە پەشێوییەك کە سێ بەریتانی و نۆ کرێکاری تێدا کوژرا و پێش ئەوەی ڕووداوەکان بەشێوەیەك گەشە بکەن کە خزمەتی شاو دار و دەستەکەی نەکەن، حکومەت هەڵسا بە گرتنی سەرکردە شیوعییە ناگرتووەکان لە ئەنجامی ئەو گرتنانەش سوپا دەستی گرت بەسەر سەنتەرەکانی بەرگریکردن کە مانگرتووەکان لە عبادان پشتیان پێ بەستبوو، کاتێک حکومەتی ئەمریکیش نێردراوی خۆی ئەفریل هاریمانی لە پازدەی تەموزی ساڵی ۱۹۵۱ ناردە تاران پارتی تودە خۆپیشاندانی توندی دژ بە ئیستیعماری ئەنگلۆ- ئەمریکی و نێردراوەکەی ڕێکخست[۱۰]، حکومەتی بەکرێگیراوی ئێرانیش بە دڵڕەقییەکی بێ وێنە سەرکووتی کرد، زیاتر لە بیست کەسی کوشت و زۆریش بریندار بوون، هەروەها هەڵسا بە گرتنی شیوعییەکان و دەستی بەسەر ڕۆژنامە شیوعییەکاندا گرت، ئەم ڕووداوانەش سەرەتاکانی ناکۆکی نێوان دکتۆر موسەدەق و پارتی تودە ئاشکرا کرد، کاتێك دکتۆر موسەدەق لە ویلایەتە یەکگرتووەکان نزیك بووەوە و وتووێژی لەگەڵ سەرۆکی ئەمریکی ترومان کرد، پارتی تودە وتوێژی دیموکراتی تر وەکو ناڕەزایی دەبڕین لەسەر سیاسەتی موسەدەق لە شەشی کانونی یەکەمی ساڵی ۱۹۵۱ خۆپیشاندانێکیان لە شەقامەکانی تاراندا ڕێکخست، ئەم خۆ پیشاندەرانەش تووشی پێکدادان بوون بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ لەگەڵ پۆلیس و لایەنگرانی موسەدەق و ئەندامانی پارتەکەی (پارتی

بەرەی نیشتمانی)،ئەمەش بووە هۆی کوژرانی پێنج کەس و برینداربوونی پتر لە ٢٠٠ کەس. وای لێ هات کە ڕوون بێ چەپەکان لەسەرووشیانەوە پارتی تودە پشتگیری موسەدەقیان نەدەکرد[١١]. تێبینی ئەوە دەکرێت کە پارتی تودە بەڕاشکاوی ڕایگەیاند کە ڕازی نیە لەسەر سیاسەتی نەرمی موسەدەق بەرامبەر بە ڕۆژئاوا و کۆششکردنی بەردەوامی بۆ وەرگرتنی یارمەتی لە ولایەتە یەکگرتووەکان. و داوای پەیڕەوکردنی ڕێبازێکی سیاسی چەپڕەوی توندڕەوی دەکرد، هەرچی ولایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیان ئەوە بە ڕاشکاوی لەسەر زاری ڕۆژنامە کۆنە پەرستەکانیان لە لێدوانەکانیاندا بەرپرسی هەردوو حکومەتەکەیان دڵەڕاوکێی خۆیان لە قەڵەمڕەوی زیادبووی پارتی تودە و ترسیان لە کودەتایەکی شیوعی لە تاران ڕاگەیاند، لەو ماوەیەدا (بەهاری ١٩٥٢) دام و دەزگاکانی پروپاگەندەی ئەمریکی و بریتانی جەختیان لەسەر زیادبوونی مەترسی شیوعی لە تاران و، گرنگی پشتگیریکردنی شا بۆئەوەی دژی ئەم ڕەوتە بوەستێ، دەکردەوە. واپێدەچێ کە ولایەتە یەکگرتووەکان –سەرەڕای نزیکبوونەوەی موسەدەقیش لێی– لەوە دەترسا کە ڕووداوەکان بە ئاقارێکدا بڕۆن کە پارتی تودە کە لە هەموو پارتەکانی تر جەماوەری تر بوو، دەسەڵات بگرێتە دەست بەمەش پاشەڕۆژی هەموو بەرژەوەندییەکانیان لە ڕۆژئاوا لە دەست بدات، بەم شێوەیەش کۆششی کرد بۆ ڕوخاندنی حکومەتی موسەدەق. بۆرژوازییەتی ئێرانی مەیلی بۆ ئەوە هەبوو کە پەنا بباتە بەر ئیستیعمارییەکان بەهۆی ترسیان لە فراوانبوونی داهاتووی بزوتنەوەی میللی،

ئەوەی کە لەم ڕووەوەش سیمایەکی جیاکەرەوەی هەیە ئەو وتوویژە بوو کە لەلایەن سەفیری ولایەتە یەکگرتووەکان لە ئێران مستەر جەریدی و دکتۆر موسەدەق ڕوویدا، ئەوەبوو مستەر جریدی دکتۆر موسەدەقی بەوە تاوانبار کرد کە وڵات بەرەو فەوتاندن دەبات، موسەدەقیش لەسەر ئەم تاوانبارکردنە بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە:

"ئەگەر بووینە شیوعی ئەوا گوناهباران ئینگلیز و ئێوە و –ولایەتە یەکگرووەکان– دەبن، کە پەیامی وەستاندنی بڵاوبوونەوەی شیوعییەتی لە جیهاندا دەکەوێتە ئەستۆی"[12].

بەڵام سەرەڕای ئەو فشارەی فەرمانگە ئیستیعمارییەکان لە هەریەکە لە ولایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا خستیانە سەر موسەدەق بۆ نەرمی نواندن لە مەسەلەی خۆماڵیکردنی پترۆڵی ئێرانی، کەچی دکتۆر موسەدەق خۆی بە دەستەوە نەدا، لەبەر ئەوەی مەسەلەی خۆماڵیکردن لە دەستی جەماوەردا بوو، و نەدەکرا پاشەکشەی لێ بکرێ، لەگەڵ ئەوەش موسەدەق و لایەنگرانی ڕێگایان نەدا بە گەشەکردنی بزوتنەوەی کرێکاری و جوتیاری و ڕێکخستنی و چەکدارکردنی بە جۆرێك کە بکرێت لە ڕووبەڕووبوونەوەی هەر بەرەنگاربوونەوەیەکی ئیستیعماری سەربازی پشتی پێ ببەسترێ، و پارتی تودە و سەندیکا یەکگرتووەکان و ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی تر بەردەوام لەسەر پەیڕەوکردنی چالاکیەکانی خۆیان لە هەمان بارودۆخی کاری نهێنی لەو ڕژێمەی کە لە پێش حوکمی موسەدەق بوو. هێزە کۆنەپەرستەکان لەدواشیانەوە هێزە ئیستیعمارییەکان توانیان حوکمی موسەدەق نەهێڵن بە

سوودوەرگرتن لەو هەولانەی کە ئەو و بزوتنەوەی نیشتمانی ئێرانی بەگشتی تێی کەوتن. دکتۆر موسەدەق بەتەواوی دەیزانی کە بازنەی کۆشك بە سەرۆکایەتی شا ڕێکخەر و لەدوای هەموو پیلان و داودانانەوەن، هێزە نیشتمانی و پێشکەوتووخوازەکان لە ئێران لەسەروو هەمووشیانەوە پارتی تودە پلانە ئیستیعمارییەکانیان ئاشکرا کرد، داوای پەیڕەوکردنی ڕێ و ڕەسمی پراکتیکیان کرد، ڕۆژنامەی "شەجاعەت" لە شازدەی ئابی ١٩٥٣ نوسی:

"ئێمە بە هاوولاتییەکانمان ڕادەگەیەنین کە پیلانگێڕان لە هەوڵەکانی خۆیان بەردەوامن ئێمە داوا لە حکومەت دەکەین خائینە ئاشکرابووەکان بگرێ و بە توندی سزایان بدات. ئێمە بەتووندی ڕایدەگەیەنین هەر نەرمی نواندنێك لەم بوارەدا خیانەتێکی ڕاشکاوانەیە لە خەباتی گەلی ئێرانی دژی کۆلۆیالیزم"[١٣].

سەرەڕای ئەو خۆپیشاندانای داوای سزادانی خائینان و پیلانگێڕانیان دەکرد حکومەتی موسەدەق لە هەڵوێستی سلبی خۆی بەردەوام بوو، لەدوای ئەوەش پارتی تودە ڕووی کردە گەلی ئێرانی، لیژنەی مەرکەزی لە بانگەوازەکەیدا داوای لەناوبردنی ڕژێمی پاشایەتی و ڕاگەیاندنی ئێرانێکی کۆماریی دیموکراتی کرد، داوای پێکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتووی لە هەموو هێزەکانی دژ بە ئیستیعماری کرد بۆ لەناوبردنی پیلانی ئیستیعمارییەکان، و بانگەوازەکەی پارتی تودە ووتی:

"شــای بــەگرێگیراوی ســەرەکی ئیــستیعمار ڕای کــرد، کەچــی بەکرێگیراوەکانی تری ئیستیعمارییەکان و لایەنەکانی پیلانگێڕان هێشتا هەر ماون، بۆیە هێشتا مەترسی وولات دەگرێتەوە"[١٤].

پارت و ڕەوتە سیاسییەکانی تر :

پارتی تودە بە تاکە پارت دادەنرێ کە بەپێی ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو ڕوون هــەنگاوی دەنــا کــە ئامــانجی دامەزرانــدنی ڕژێمێکــی فــەرمانڕەوایی دیمــوکراتی و دەرکردنــی مۆنۆپۆلییــە بێگانــەکان و هــەموو شــێوەکانی خۆسەپاندنی ئیستیعماری هەبوو، لەدوای دامەزراندنی پارتەکە و فروانبـوونی میللەتی و زیادبوونی ئەندام و لایەنگرەکانی بەتایبەتی لەنێوان کرێکارەکان و جووتیاران، ئیستیعمارەکانی ئەنگلۆ- ئەمریکان کـەش و هـەوای لواویـان بـۆ بەکرێگیراوان و کۆنەپەرستان و سیخوڕان ڕێکخست بۆ ئـەوەی خۆیـان لـەژێر سـێبەری "پارتــەکان" و کۆمەڵــەکان ڕێـك بخەنــەوە بـۆ ڕووبەڕووبوونــەوەی هەڵکشانی جــەماوەری میللــی. ئــەم کۆمەڵــە ڕاســتڕەوە لــە کۆمەڵــە و تــاك پێکدەهاتن کە لە شا و کۆشکی ئیمپراتۆری دەست پێدەکات، زۆربەی گەورە ئەفسەرانی سوپا، زۆربەی هــەرە زۆری نوێنــەرانی ئەنجومــەنی پــازدەی ئــەو کات، مولکدارەکانی زەوی و زار و گــەورە بازرگانــان ... ئــەم کۆمەڵەیــە وای دەبینی کە بوون و مانەوەی وا پێویست دەکات کە پەیوەست بێ بە ولایەتــە یەکگرتوەکان و بریتانیا و بەدەستهێنانی قەرز و بەخـشینی ئـەمریکی و پـتر کردنــی داهاتــە پترۆڵییــەکان بــە زیــادکردنی بەرهــەمی کۆمپانیــای پترۆڵــی ئەنگلۆ- ئێرانی.

کۆمەڵەیەکی ناوەندییەتی سەریهەڵدا کە لە هەندێ ناسیۆنالیزمی نیشتمانی بەسەرکردایەتی دکتۆر موحەمەد موسەدەق پێکهات و بەرەیەکی ئۆپۆزسیۆنیان لە ئەنجومەنی نوێنەرایەتی پێك هێنا. لایەنگران لە ڕاستڕەوە توندڕەوەکان لە دەوروبەری ئەو کۆمەڵەیە کۆبوونەوە و کۆمەڵەی موجاهیدکەرانی ئیسلام لە پیاوانی مەلا کاشانی و تەنانەت پێشمەرگەکانی ئیسلام کە توندڕەوتر بوون بەسەرکردایەتی سەید سەفەوی، و ژمارەیەك لەوەی بە پارتە بچووکەکانی خاوەن ڕەوشی فاشی ناو دەبرێن گرنگترینیشیان پارتی تویلرز بوو بەسەرکردایەتی مەزەفەر باغای هەروەها ژمارەیەك لە قوتابیان و مامۆستایانی زانکۆی تارانیش لە دەوری کۆبوونەوە، لەگەڵ بازرگانان و بزنزمانە بچووکەکان، ئەوانە ڕووبەڕووی مونافەسەی کۆمپانیا و دام و دەزگا بیانییەکان بوونەوە، بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵەی ناوەندێتی بەسەرکردایەتی دکتۆر موسەدەق هەموو ئەو ڕەگەزانەی بەخۆوە گرت لەبەر هۆیەك یان هۆیەکی تر – ڕازینەبوون لەو بارودۆخەی ئەو کات هەبوو، و سیاسەتی لایەنگیری ڕۆژئاوای کۆمەڵە ڕاستڕەوەکە بەسەرکردایەتی شا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دژی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتەکانی پارتی تودە (گەل) بوون. ئەو کۆمەڵەیە وایدانا کە ناخۆشییە ئابوورییەکان لە وڵاتدا بەهۆی دەسەڵاتی بەرژەوەندییە بێگانەییەکانە بەتایبەتی کۆمپانیای پترۆڵی ئەنگلۆ– ئێرانی واشی دەبینی کە چارەسەرکردنی ناخۆشییە ئابورییەکان بە دەست بەسەرداگرتن و دەرکەوتنی بەژەوەندییە بێگانە بەهێزەکانە بەبێ ئەنجامدانی هەر گۆڕانێك لەژێرخانی ئابووری باو.

لەبەرئەوە چاوپێکەوتن لەنێوان پارتی تودە و کۆمەڵە چەپڕەوەکانی تر و کۆمەڵەی ناوەندێتی لەسەر بنەمای هەڵوێستی یەکگرتوویان بوو لە پێکهاتنی ئەو هەڵوێستە لەلای هەر یەکێکیان، یەکەمیان لەڕووی ئایدیۆلۆژییەوە باوەڕی هەبوو، بەدەرکردنی هەموو خۆ سەپاندنێکی بێگانە، دووەمیشیان لەسەر بنەمایەکی سۆزدارانە بوو. ئەمەش مەترسی کۆمەڵەی ناوەندییەتیمان لە هاوکاریکردن لەگەڵ کۆمەڵەیچەپڕەو بۆ شی دەکاتەوە، یەکەمین پەرت بوو بەجۆرێك کە کاشانی و دار و دەستەکانی تر بە تۆمەتی توندڕەوی چەپڕەوی لێی جیابوونەوە، و کۆمەڵەی چەپڕەوی ناچاربوو ڕووبەڕووی ببێتەوە. هەندێ لە نووسەران ماوەی ١٩٤١ تاکو ڕوخاندنی حکومەتی موسەدەقی نیشتماتی لەساڵی ١٩٥٣ دابەش دەکەنە سەر چوار قۆناغ: "ماوەی یەکەم ڕاستەوخۆ دوایدەستهەڵگرتنی ڕەزا شای پەهلەوی لە تەخت بۆ کوڕەکەی دەست پێدەکات و تاکو ساڵی ١٩٤٦ بەردەوام بوو. لەو ماوەیەشدا وەکو لە ماوەکانی دواتردا پارتی تودە دەستی بەسەر شانۆی سیاسیدا گرت. پارتی ویستی نەتەوە بەسەرکردایەتی سەید زیا لەلایەن بریتانیا دامەزرا بۆ دژایەتیکردنی تودە. لەپاڵ ئەم دوو پارتەش ژمارەیەك پارتی تر هەبوون، ئەمەش چ لە دەرەوە یان لە ناوەوەی ئەنجومەن، و چەند پارتێکی نەتەوەییشی کە لەچەند کۆمەڵەیەك لە قوتابیان یان لە ڕۆشنبیرە یەخەسپییەکان یان پیشەییەکان پێکهاتبوو. ماوەی دووەمیش بە قەوام ئەلسەڵتەنە دەست پێدەکات و کۆتایی پێدێت، کە یەکێکە لە دیارترین ئەو سیاسیانەی لە ئێراندا پەیدابوون. بەدیارکەوتنیشی بووە هۆی

هەڵوەشانەوەی پارتی ویستی نەتەوە و پارتی ئێرانی دیموکراتی جێگای گرتەوە. و بە کەوتنی قەوامیش پارتی دیموکراتی کەوت و بە ئەزموونێکی وروژاو کۆتایی پێ هات. سەرهەڵدانی پارتی تر بەردەوام بوو، ئەوە و لەپاڵ پارتە ناودارەکان و نەتەوەییەکان لە چینی ناوەڕاست پارتی ئاینی بنەڕەتی و پارتی میللی سەریان هەڵدا ئەو دوو پارتەی کە وەکو ئامرازێك بۆ قەڵەمڕەوی کەسی بەکارهاتن.ماوەی سێیەمیش لە کەوتنی پارتی ئێرانی دیموکراتی دەستی پێکرد و بە قەدەغەکردنی پارتی تودە تاکو ساڵی ١٩٥١ کوشتنی جەنەڕاڵ رازمارا بەردەوام بوو. لەم ماوە زەمەنییەدا پارتە توندڕەوەکان بەشێوەیەکی چالاك پەرەیان سەند. تودە دەستی بەوە کرد کە بە نهێنی چالاکییەکانی خۆی ئەنجام بدات، کەش و هەوایەکە بەهۆی ئەگەری ڕوودانی کودەتا ئاڵۆز بوو. هەرچی ماوەی چوارەمە ئەوە کۆنترۆڵکردنی بەرەی نیشتمنی بەسەرکردایەتی موسەدەق دەنوێنێ، لە ژمارەیەك پارتی نەتەوەیی لە چینی ناوەڕاست هەروەها لە چەندین کەسایەتی دیار پێکدەهات. تێبینی ئەوە دەکرێت کە لە کاتێکدا هەموو پارتەکان هەوڵیاندا چاولێکەری ڕێکخستنی تودە و شێوازەکانی پروپاگەندەکەی بکەن، ئەوە زۆریەی سەرکردەکانی بەرەی نیشتمانی، بە دەرلوتنی موسەدەق، لەڕێگای قەوام ئەلسەڵتەنەوە ناودارییان بەدیهێنا. موسەدەق ڕازی نەبوو بەوەی کە بەرەی نیشتمانی بۆ پارتێکی سیاسی بگۆڕێ"[152].

لە ڕاستیدا هەندێ لە نووسەرە بۆرژوازییەکان و هی تر ئەو ماوە گرنگە لە مێژووی بزوتنەوەی نیشتمانی ئێرانی بەش بەش دەکەن بۆ چەند قۆناغێك لە هەوڵێکیاندا بۆ شاردنەوەی و شێواندنی خەباتی گەلانی ئێرانی. دامەزراندن و دروستکردنی پارتەکانی لایەنگیری ئیستیعمار و بە دانپێدانانی خودی نووسەرە بۆرژوازییەکان هەردەم ئامانجی پەرتکردنی یەکێتی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلانی هەیە.

شایەنی باسە کە پارتی دیموکراتی ئەوەی قەوام ئەلسەڵتەنەی ناسراو بە مەیلی بۆ ئەمەریکییەکان لە ساڵی ١٩٤٥ دایمەزراند، یارمەتی دارایی گەورەی لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەرگرت، ئەم پارتەش لە هەمان ساڵدا دەوروبەری نیو ملیۆن دۆلاری لە سیخوڕیکردن لەسەر بزوتنەوەی نیشتمانی لە ئازەربیجان و کوردستان و عەرەبستان خەرج کرد[١٦].

بەرەی نیشتمانی :

لەڕاستیدا لە کاتی گوێبیستبوونی ئەو ناوە هەندێك کەس شتەکە تێکەڵدەکەن و وادەزانن کە دکتۆر موسەدەق سەرکردایەتی بەرەیەکی فراوانی کردووە کە جۆرەها پارتی نیشتمانی و پێشکەوتنخوازی جیاوازی بەخۆوە گرتووە، ڕاستیشی پێچەوانەی ئەمەیە، ئەوەی بوو بە کۆبوونەوەی کەسایەتی دیار دەستی پێکرد کە موسەدەق توانی بە زیرەکی و ڕۆشنبیریی خۆی متمانەیان بەدەست بهێنێت و سەرۆکایەتییان بکات. دەبێت پێش ئەوەی باسی ئەو بەرەی نیشتمانییە بکەین، بێینە سەر گرنگترین پارت کە موسەدەق بە کۆڵەکەی دانابوو، ئەویش پارتی ئێرانی بوو.

دامەزراندنی پارتی ئێرانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٤٢ کە کۆمەڵەیەکی ئەندازیاران دامەزرا بەدرێژایی ساڵێکی تەواو وەکو کۆمەڵەیەکی پیشەیی مایەوە کە ئەندازیاران و بەتایبەتی حکومییەکانی بەخۆوە دەگرت، و لە ساڵی ١٩٤٣ و لەسەر داواکاری هەندێ کەسایەتی کە ئەندازیار نەبوون کۆمەڵەکە بۆ پارتی ئێرانی گۆڕا. لە هەندێ سەرچاوەی تریشدا هاتووە کە پارتەکە لە ساڵی ١٩٤٤ و لەژێر دروشمی "کار و داد و ئازادی" دامەزراوە و ئەندامە دامەزرێنەرەکانی لە خێزانە بۆرژوازیی و ڕۆشنبیرە بۆرژوازی و نیشتمانپەروەرەکان بوون و سیمای پیشەیی بەسەر پارتەکەدا زاڵ بوو. پارتەکە زنجیرەیەك کوراسە و کتێبی چاپ کرد، کە ئەو بنەمایانەی پشتی پێ دەبەست و ئەو بەرنامەیەی هەوڵی بۆ بەدیهێنانی دەدا و هەڵوێستی لە کێشە ناوخۆییەکان و سیاسەتی دەرەوەی ئێرانی تیا شرۆڤە کردبوو. لە ساڵەکانی یەکەمینی دامەزراندنی پارتەکە هەوڵینەدا کە جەماوەر بۆخۆی ڕابکێشێت بەڵکو جەختی لەسەر گرتنە ئەستۆی ئەو فەرمانبەرانە دەکرد کە لە دەزگاکانی دەوڵەتدا کاریان دەکرد. پارتەکە باوەڕی هەبوو بە ئەنجامدانی گۆڕانی پلەپلەیی بەوەی کە لایەنگیری خۆی لەجێگای ئەو کەسانەی کە زیاتر کۆنەپەرستن لە دەزگا هەستیارەکانی دەوڵەتدا دابنێ. یەکەمجار لەژێر سەرکردایەتی قەوام ئەلسەڵتەنە پارتی ئێران ناوداربوو کاتێك کە لە یەکێتییەکی ماوە کورت لە ساڵی ١٩٤٤ چووە پاڵ پارتی دیموکراتی و پارتی تودە. بەرەی نیشتمانی ئەو ئامرازە سەرەکییەبوو کە دکتۆر موسەدەق بۆ دژایەتیکردنی حکومەتی جەنەڕاڵ ڕازمارا بەکاریدەهێنا، دەستکەوتی

سەرەکیشی خۆماڵیکردنی پیشەسازی پترۆڵی ئێرانی بوو. شتێکی حەتمی بوو لەگەڵ یەکەمین ڕوویەڕووبوونەوەی سەرەتاسەری فراوان لەگەڵ ئیستیعمار و هێزە کۆنەپەرستەکاندا، بەرەی نیشتمانی لێك هەڵبوەشێتەوە، لەبەرئەوەی پێکهاتەی بەرەی نیشتمانی نائاسایی بوو، ئەوەبوو کە ڕەگەزەکانی هەموو توێژە سیاسی و ئاینی و چینی بۆرژوازی گەورە و جوتیاران و دەرەبەگ و ڕاست ڕەوان و هەندێ لە جەمسەرەکانی چەپی بەخۆوە دەگرت.لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٠ دانیشتوانی تاران سەرەڕای تۆقاندنی پۆلیسیی قێزەونی باو لە وڵاتدا دەنگیان بۆ ئەنجومەنی شازدە دا، بەشێوەیەکی جەماوەری دەنگیان بۆ پاڵێورلوانی بەرەی نیشتمانی دا، ئەوەی کە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٤٣ بەسەرۆکایەتی دکتۆر موسەدەق و لە کەسایەتی نیشتمانی بۆرژوازی دژ بە کۆمپانیای پترۆڵی ئەنگلۆ- ئێرانی پێکهاتبوو، ئەم هەڵوێستەی بەرەی نیشتمانیش پشتگیریکردنی کەرتی فراوانی لەگەڵ بۆ مسۆگەر کرد. دکتۆر موسەدەق گازاندەی کردبوو لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی پازدە لە ساڵی ١٩٤٣ و سەرپەرشتیکەرانی بە ساختەکردن و خیانەتکردن تاوانبار کرد، موسەدەق پەیڕەوی پەنابردنەبەری -بەست- بۆ دەرگای کۆشکی نزیك ماڵەکەی کرد، بەم شێوەیەش توانی ژمارەیەك لە پاڵێورلوان لە سەرکردەکانی پارتی چینی ناوەڕاست بۆلای خۆی ڕابکێشێت، لەدوای ئەوەی هەندێ گرێنتیان بەدەست هێنا، ئەوانە لە ماڵی موسەدەق کۆبوونەوە، و بەرەی نیشتمانیان پێکهێنا و ژمارەیان لە دوازدە کەس تێپەڕی نەدەکرد هەندێکیان سەرکردەی پارتەکان بوون ئەوانی

تریشیان دەسترۆیشتوو و ناوداربوون لەنێان هەندێ توێژی سیاسی و پیشەییدا"[17].

بەرەی نیشتمانی دەست پێشخەری کرد لە ئەنجومەن بۆ هەمووارکردنی جیاوکی ساڵی ١٩٣٣ و ڕایگەیاند کە دژی "ڕێکەوتننامەی تەواوکەری"یە وەکو گونجاوێکیش لەگەڵ داواکارییەکانی فراوانترین جەماوەرەکانی کرێکاران، دەستەی دکتۆر موسەدەق سووربوون لەسەر ئەوەی کە هەموو سامانە پترۆڵییەکان لەدەستی ئێراندا بێت. لەدوای خۆماڵیکردنی پترۆڵیش لە پازدەی ئاداری ساڵی ١٩٥١ و لە ٢٩ی نیسانی هەمان ساڵدا دکتۆر موسەدەقی سەرکردەی بەرەی نیشتمانی کرا بە سەرۆك وەزیران، کەسایەتیە بۆرژوازیی و نەتەوەیی و ڕۆشنبیرەکان ئەوانەی "بەرەی نیشتمانی"یان پێك دەهێنا، وایان دەبینی کە نەهێشتی کۆمپانیای پترۆڵی ئەنگلۆ- ئێرنی ئامرازێکی سەرەکییە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو تەنگژە ئابووری و داراییەی لە وڵاتدا باوبوو بۆ وەستان بەڕووی مەترسی "هاتنەناوەی شیوعی" هەروەکو چاوەڕوانیش دەکرا، ئیستیعمار و کۆمپانیا مونۆپۆلییەکانی هەڵوێستی تەماشاکارانەیان نەبوو، بەڵکو خۆیان ئامادە کرد و بەکرێگیراوەکانی خۆیان کۆکردنەوە و پیلانیان دانا بۆ شکستپێهێنانی یاسای خۆماڵیکردن، کردەوەیەکی پیلانگێڕانەی هاوبەشی ئەنگلۆ- ئەمریکی دەستی پێکرد کە بە مەبەستی ناچارمردنی موسەدەق بوو لەسەر وازهێنان لە "توندڕەوییەکەی و دانیشتن لەسەر مێزی گفتوگۆ کردن. لەم کاتەشدا پاتی تودە و ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی تر پێشنیارییان کرد، کە کاری هاوبەش دژی

ئیستیعمارییەکان بکەن، موسەدەق ڕازی نەبوو[18]. خاڵی ناکۆکی لەنێوان پارتی تودە و موسەدەق جەوهەری بوو، لەوەدا بوو کە ڕازی بن یان ڕازی نەبن لەسەر نەهێشتنی بەرژەوندییەکانی بێگانە و ئەنجامدانی گۆڕانی بنەڕەتی لە ئابووری ئێرانی نیشتمانی لە هەمان ئەو کاتەی کە جیابوونەوە کەوتە نێوان "بەرەی نیشتمانی". چوونە دەرەوەی حوسەین مەکی راوێژکاری پترۆڵی موسەدەق لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٥٢ لێدانێکی بەهێزبوو بۆ بەرە، ئینجا دکتۆر باکای جیابۆوە و موسەدەقی بەوە تۆمەتبارکرد کە سیاسەتێکی نەرم بەرامبەر بە شیوعییەکان پەیڕەو دەکات لەدوای ئەمەش کەسایەتی ڕۆشنبیری تیتۆیی پارتی تویلرزی بەدواداهات ئەوەی کە وازی لێهێنا و پارتکی موسەدەقی نوێی لایەنگیری دامەزراند

کە بە "هێزی سێیەم" ناوبرا، کاتێك کە خەلیل مالکی سەرکردەی هێزی سێیەم هی تر وازیان لە نوسین هێنا بۆ ڕۆژنامەی (شاهد) ی نەتەوەیی گرنگی و دەستڕۆیشتوویی خۆیی لەدەست دا. کاتێك لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩٥٣ ئایەتولا کاشانی جیابۆوە لەبەرئەوەی لە موسەدەق تووڕە بووبوو بە هۆی نەرمی نواندنی لەگەڵ شیوعییەکان، تەنها چەند کەسایەتییەکی تر مانەوە کە دەستیان نەدەڕۆیشت. بەم شێوەیەش ئەرکەکە ئاسان بوو بۆ ئیستیعمارییەکان بۆ خستنی یاسای خۆماڵیکردنی نیشتمانی، و پشتیان بە سو پا بەست، موسەدەقیش بوێری نەکرد یان نەیویست لایەنگرانی شا و دارو دەستەکەی لەناو ببات. نووسەری ئینگلیزی ئیفل ساتۆن نووسی:

"لەدوای سەرنەکەوتنی وتوێژەکان لەبارەی پەترۆڵ لە هاوینی ساڵی ١٩٥٢ ئەمریکییەکان دەستیان پێکرد و زیاتر و زیاتر مەیلییان بەرەو بۆچوونی ئەمریکی دەچوو، بەوەی کە موسەدەق وەکو گرێنتییەك نەماوەتەوە دژی شیوعییەت، تاکە هەڵبژاردنێکیش بریتی بوو لە: کودەتای سەربازی. بڕیاری داواکردنی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە کوتایە لەلای شا و دار ودەستەکەی گەڵاڵە ببوو".

لیژنەی مەرکەزی پارتی تودە بانگەوازێکی بۆ گەل کرد تیایدا ئاگاداری کردبۆوە لەو مەترسییەی ڕووبەڕووی وڵات دەبێتەوە، و داوای خەباتی توندی کرد دژی سیاسەتی ئستیعماری ئەنگلۆ- ئەمریکی، و داوای ئازادیکرد بۆ چالاکی پارتەکە و ڕێکخراوە دیموکراتییەکان و سەندیکاکان و ئازادکردنی بەندییە سیاسییەکان و پێکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتووی بۆ هەموو هێزەکانی دژ بە ئیستیعمار کرد، بانگەوازەکە ڕوونی کردەوە کە پارتی تودە ئامادەیە بۆ پێکهێنانی بەرەکە، بۆ هاوکاریکردن بە دڵسۆزی لەگەڵ کەسایەتی و ڕێکخراوەکانی دژ بە ئیستیعمار، کەچی حکومەتی موسەدەق خۆپیشاندانە میللیەکانی پەرت و بڵاو کردەوە لە جیاتی چەکدارکردنی گەل بۆیەکە کەوتنی حەتمی بوو.

هۆیەکانی شکست :

حکومەتی موسەدەق پشتگیری چەند کەرتێکی فراوانی گەل و چەندین پارتی بەدەست هێنابوو، کە گرنگترینیان و لەسەر وویانەوە پارتی تودە بوو. کەچی دەستەو کۆمەڵە جیاوازەکان لەنێوان ڕاستڕەوەکان و ڕاستڕەوە

توندڕەوەکان و تەنانەت ئەو چەپانەی هاتبوونە ناو "بەرەی نیشتمانی" یەکسەر دوای ئەوەی وازیان لە موسەدەق هێنابوو. وەکو ئەوەی بینیمان کە کۆمەڵەی ڕاستڕەوی کۆنەپارێز بەسەرکردایەتی کاشانی و باکای، چوونە خانەی دژایەتیکردنی موسەدەق لە ململانێکەی لەگەڵ شا. ئەوە و موسەدەق ڕازینەبوو بەوەی هاوپەیمانییەتی لەگەڵ پارتی تودە بکات، بۆئەوەی بەوە تۆمەتبار نەکرێ کە شیوعییە، پارتی تودە سیاسەتێکی هەڵەی بەرامبەر بۆرژوازییەتی نیشتمانی و حکومەتی موسەدەق پیادەکرد، بەتایبەتیش لە ڕێ لادانی چەپڕەوانە لە چالاکی پارتەکەدا لە ١٦-١٩ی ئابی ١٩٥٣ کە بۆرژوازییەتی نیشتمانی تۆقاند و ورووژاندی[١٩].

"باختەرا ئەمروز" ڕۆژنامەی زمانحاڵی بەرەی نیشتمانی بوو، کە دکتۆر حوسەین فاتمی دایمەزراندبوو، ئەویش لەنێوان ئەو کەسانەبوو کە خۆیان بە بەرەوە بەستبۆوە، و لەخێزانێکی گەورە و دەستڕۆیشتوو هاتبووە خوارەوە، و چەند داهێنانێکی لەبواری ڕۆژنامەگەری پیشاندابوو، و بووە قسەکەر بە زمانی بەرە، هەروەها بووە پیاوی دووەم لەدوای خودی موسەدەق.

پاری سێیەم

بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی لە باکوری ئێران

لەپێشتردا لە پاری پێنجەم لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد کە یەکەم هەوڵ بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی شۆڕشگێڕی لە ئازەربیجان لە ساڵی ١٩٢٢ لە تەورێز بوو، کەچی هەر زوو لەبەر هەندێ هۆ، کە باسمان کردبوو،

سەرنەکەوتبوو. هەوڵی دووەمیش کە لەباربردرا لە دوازدەی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ بوو. گەشەکردنی بزوتنەوەی نیشتمانی لە ناوچەی باکوری ئێران و بەتایبەتی لە ئازەربیجان و کوردستان، و دمەزراندنی ڕژێمی فەرمانڕەوایی شۆڕشگێڕی لەوێدا دەگەڕێتە بۆ چەندین هۆکار لەسەرووی هەمووشیانەوە چەوسانەوەی نەتەوایەتییە، هەروەکو ڕوویداوە و ئێستاش لە عەرەبستان ڕوودەدات، کە ڕژێمی بەکرێگیراوی ئێرانی هەڵدەستێ بە عەجەمکردنی ناوچەکە و کۆچپێکردنی عەرەب بۆ ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران لەترسی گەشەکردنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی لە ناوچەکە، ئەوەی کە تاوەکو ساڵی ١٩٢٥ سەربەخۆبوو لە ئێران. بەم شێوەیەش ئازەرییەکان و کوردەکان لە سادەترین مافە دیموکراتییەکان بێ بەشکران، کە مافی قسەکردنە بە زمانی نەتەوایەتییان.

خانە کۆنە پەرستەکان و پۆلیس لەژێر سەرپەرشتی و ئاراستەکردنی دەرەبەگان و گەورە موڵکدارانی زەوی، ناشیرینترین جۆرەکانی چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و سەرکوتکردنیان پەیڕەو دەکرد. لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٤٤ خەباتی جەماوەری بۆ باشترکردنی بارودۆخی ژیان و لەپێناو ئازادییە دیموکراتییەکان توونذتر بوو، لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٤٥ بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی هەموو شار و گوندەکانی گرتەوە، تاکو ئەیلولی ساڵی ١٩٤٥پارتی تودە ڕاستەوخۆ سەرکردایەتی ئەم بزوتنەوەیەی دەکرد، بەڵام بەلەبەرچاوگرتنی بارودۆخی تایبەتی لە ئازەربیجانی ئێرانی ئەوە دەبووایە هەموو هێزە نیشتمانییە دژ بە فاشییەت یەکبخرایە، بۆیە لە سێی ئەیلولی

هەمان ساڵدا "پـارتی دیمـوکراتی ئازەربیجـانی" لـە شـاری تـەبرێز پێکهـات، نوێنەرانی هەموو توێژەکانی دانیشتوان چوونە ناو ئەو پارتـە، لـە ماوەیـەکی کورتدا پارتەکە گۆڕا بە پـارتێکی نیـشتمانی جـەماوەری دیمـوکراتی، ئـەوەو ڕێکخـراوی پـارتی تـودە لـە ئازەربیجـان دامەزرانـدنی پـارتی دیمـوکراتی ئازەربیجانی پێ باش بوو، لـسەر ئـەو بنەمایـەی دەربڕینـە لەویـستی گـەل و بڕیـاری چـوونە ناوەوەیـان دا. پـارتی دیمـوکراتی ئازەربیجـانی داواکـاری بەخـشینی سـەربەخۆیی ڕۆشـنبیری و ئیـداری بـۆ ئازەربیجـانی ئێـران لەچوارچێوەی دەوڵـەتی ئێرانـی و داواکـاری نەتەوایـەتی تـری بـەرزکردەوە. کەچی هێزە کۆنەپەرستەکان لـە دەرەبگـەکان و خانـەکان بـە ئـاگر و ئاسـن وەڵامـی ئـەم داواکارییانـەیان دایـەوە. تەنهالـە مـانگی ئەیلولـدا دوو سـەد هاوڵاتی کوژران و زیاتر لە هەزار کەس لە لایـەنگرانی بزوتنـەوەی دیمـوکراتی گیران، کرێکاران و جووتیاران بە پێکهێنانی دەستە چەکدارەکان بۆ بـەرگری لەخۆ کردن "تیپی پێشمەرگەکان" وەڵامـی ئـەم تۆقاندنانـەیان دایەوە[20]. لـە ١٢ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ پـارتی دیمـوکراتی ئازەربیجـانی بەتـەواوی دەسەڵاتی گرتە دەست، لەدوای ماوەیەکی کورت هێزە چەکدارەکانی ئێران و پـۆلیس لـە هـەموو شـار و ناوچـەکانی ئازەربیجـان چـەکی خۆیـان فرێـدا. و بـەدیهێنانی بەرنامەیـەکی دیمـوکراتی فـراوان دەسـتی پێکـرد. کۆمـاری دیمـوکراتی ئازەربیجـان بەسـەرکردایەتی جەعفـەر پیـشەوەری، و دکتـۆر مالکۆلم، و غولام حوسێن ڕەزا زادە، و سەرتیبپ زادە، و زۆر لە کەسایەتییە سیاسی و سەربازی نیشتمانپەروەری پێشکەوتنخوازی دیار لە ئێران دامەزرا.

هێزە پێشکەوتنخوازەکان لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە ڕوویان کردە ئازەربیجان:

- بارودۆخی سروشتی لواو و پتر بوونی هۆشیاری شۆڕشگێڕانە لە ناوچەکەدا.
- لە پێشتردا هەولێکی تێدا درابوو، و دەکرێ سوود لە هەڵەکانی ڕابردوو وەربگیردرێ.
- نزیکی ناوچەکە لە سەرچاوەی یارمەتی کە خۆی لە حوکمی شۆڕشگێڕانە لە یەکێتی سۆڤییەت دەبینییەوە.
- لاوازبوونی بەریتانی لە ئێران، ئێران و دەوڵەتە ئیستیعمارییەکان بە نەهێشتنی لایەنەکانی شەڕ خەریك بوون، و دووری ئازەربیجان لەو دەستانە[21].

یەکەم هەنگاو کە حکومەتی جەعفەر پیشەوەر گرتیە بەر بەدیهێنانی بەرنامە شۆڕشگێڕییەکەی ئابووری و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیرییەکەی بوو، ئەوەبوو ڕێوشوێنی خێرا گیرایە بەر بۆ دامەزراندن و فراوانکردنی پیشەسازی و یاسایەکی کرێکاری نوێ دارێژرا و چاکسازی کشتوکاڵی جێبەجێکرا. ئەوەبوو دەسەلاتی میللی لەماوەی یەك ساڵدا (٢,٥) دیکر زەوییان بە خۆڕایی بەسەر جووتیاراندا دابەشکرد. تەنانەت دوژمنانی حکومەتی شۆڕشگێڕیش لە تەوریز دانیان بوەدا نا کە لەماوەی یەك ساڵدا لە حوکم دیموکراتی توانی زیاتر لەوە بەدەست بهێنێت کە لە ماوەی بیست ساڵدا لەژێر حوکمی ڕەزا خان بەدەست هاتبوو[22]. بەلەبەرچاوگرتنی بەدەست

هاتووە شۆڕشگێڕییەکانیش، شۆڕشی میللی بوونێکی فراونی بەدەستهێنا، بوونی کۆماری دیموکرتی ئازەربیجان گەورەترین کاریگەری لە سەرجەم ناوچەکەدا لەسەر بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی هەبوو، هەر زوو حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ پێکهات ئەویش کۆماری دیموکراتی مەهاباد بوو لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٥ بەسەرکردایەتی قازی محەمەد و هاوڕێیەکانی.

لە هاوینی ساڵی ١٩٤٢ کۆمەڵەیەکی نەتەوەیی کوردی لە سەنتەری مەدەنی گرنگ لە ناوچەی کوردی لە ئێران پێکهات، ئەم کۆمەڵە نهێنییەش داوای جێبەجێکردنی بەرنامەیەکی دیموکراتی کرد، کە دەوەستایە سەر دامەزراندنی خود موختارییەکی سیاسی ڕۆشنبیری لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئێرانیدا، نەتەوەپەروەرانی توندڕەوی ئێرانی لەم کۆمەڵە نهێنییە ترسان و دژایەتییان کرد، لەترسی ئەوەی بەرنامەکەی لە خودموختاری گەشە بکات بۆ جیابوونەوەی کوردەکان. حوکمی شۆڕشگێڕی سۆڤییەت پشتیوانییان لە بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی کرد و بەشداریشیان لە خێراکردن و گەشەپێکردنی بەرنامەکەی کرد. لە ساڵی ١٩٤٥ قازی محەمەد بەسەرکردایەتی کۆمەڵە واتە "کۆمەڵەی نەتەوایەتی کوردی" ڕازی بوو، قازی محەمەد داوای چاکسازی کشتوکاڵی و کۆمەلایەتی کرد، و بەڵێنیدا کە پەیوەندی لەگەڵ کۆماری دیموکراتی ئازەربیجان پتەو بکات. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٤٦ قازی محەمەد بەیانێکی دەرکرد تیایدا سەربەخۆیی کوردەکانی ئێرانی ڕاگەیاند، و چەندین لە سەرکردە دیار و پێشکەوتنخوازەکان و نیشتمانپەروەرەکان بەیانەکەیان واژوو کردبوو. بەرامبەر بەم گەشەکردنە

١٢النفط يستعبد ايران، ص١٠٠– ١٠١.

١٣ المصدر السابق، ص١١٢– ١١٣.

١٤المصدر السابق.

[٥] Iran, Political Development in a changing society, by Lenard Binder, ١٩٥٢, Pp.٢٠٢–٢٠٣.

[٦] Ibid, Pp.٢٠٧.

[٧] Ibid, Pp.٢١٠.

١٨النط يستعبد ايران، ص٩٩.

١٩المصدر السابق، ص١٦٨– ١٦٩.

٢٠النفط يسعبد ايران، ص٨١–٨٤.

٢١جريدة بيروت، العدد الصادر في ٥ نيسان ١٩٧٢.

[٢] Nationalism in Iran, by Richard W. cottam, ١٩٦٤, Pp.١٢٦.

شۆڕشگێڕییە خێرایە لە هەرێمەکە لە ئازەربیجان مهاباد، و ئەو مانگرتن و خۆپیشاندانانەی دژ بە ئیستیعمار و بەگرێکیراوانی کە لە باشووردا و لە هەمان کاتدا ڕوویاندەدا، حکومەتی بە کرێگیراوی شا و بە یارمەتی دەرەبەگ و خانەکان و هێزە ئەمریکییەکان هەڵستا بە ڕەوانەکردنی هێزێکی زۆر و لە ١٥ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ حکومەتی دیموکراتی ئازەربیجان کەوت و هەروەها حکومەتی مەهابادیش. یارمەتییە ئەنگلۆ- ئەمریکییە مەزنەکان و دەست باڵایی سەربازی لە هێزەکانی شۆڕش لە هەرێمەکە لە ئازەربیجان و مهاباد ڕووبەڕووی بوونەوە، یەکێك لەو هۆیە سەرەکیانە بوو کە بووە مایەی گەڕانە دواوەی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی لە ناوچەکە.

پەراوێزەکانی ئەم بەشە :

---

[١] Iran, by John Marlowe, Pp.٥٩.

[٢] The history of Modern Iran, by Upton, Pp.٩٣.

[٣] Ibid.

٤النفط يستعبد ايران، ص٨٣ و ٨٤.

٥حول حقيقة التحولات الطبقية في ايران، بقلم آزاد – مجلة الهدف، العدد ١٢٦، الصادر في ١٣ تشرين الثاني ١٩٧١.

[٦] Iran, by John Marlowe, Pp ٨١.

[٧] Ibid.

٨البترول و الدولى في الشرق الاوسط بقلم جورج لوتروسكي، ص٢٧٩– ٢٨٣.

[٩] Iran, by John Marlowe, Pp ٩٠.

١٠مجلة البترول و الغاز العربي، العدد التاسع، الصادر في آيار ١٩٦٦.

١١ المصدر السابق.

# ململانێی مێژوویی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا
# " لە دیدی ( برۆدوێل )ەوە"

موهەنەد موبەیزین

و. لە عەرەبییەوە: هاوار محەمەد

ووتەیەکی وەرگێڕ :

دەمێکە ڕۆژئاوا مۆدێلە تەقلیدییەکەی نووسینەوەی مێژوو و چەمکی مێژوویان جیهێشتووە، جیاواز لە کۆکردنەوەی زانیاریگەلێك کە لە چەندان کتێبدا دەیەها و سەدەها جاری تر نووسراونەتەوە (تەبەری وای ووت، ابن کەسیر وای نووسی، مەسعودی و ...!!)، کە ئەم جۆرە لە تێڕوانین لە مێژوو لای خۆمان باوی هەبووە و هەیە. ڕۆژئاوا مێژوو لە هزر دانابڕێت، تەنها نووسینەوەیەکی خودییانەی ڕووداوەکان و واقیعەکان بۆیان گرنگ نیە، بەڵکو بەتەنگ خوێندنەوەی و ڕاڤە و لێکدانەوە (تأویل) ی ئەو ڕووداو و واقیعانەشەوە هاتوون. کۆمەڵێك بیرمەند دێن و بە چاوێکی دیکەوە لە مێژوو دەڕوانن. فرنان برودوێل یەکێکە لەو هزرمەند و مێژوونووسانەی کە بە سەنگێکی قورسەوە هاتە ناو گۆڕەپانی هزر و بواری نووسینەوە و ڕاڤەی مێژووەوە.

ئێمە لێرەدا ووتارێکی کورت لەبارەی دیدی (برۆدوێل)ەوە وەردەگێڕین، کە ووتارێکی هەرە سادە و سەرەتاییە، بەو ئومێدەی ببێتە دەروازەیەك تا

لەماوەکانی داهاتوودا بتوانین ووتاری درێژتر و ووردەکارتر و تێروتەسەلتر لە بارەی برۆدوێلەوە وەرگێڕین بۆ سەر زمانی کوردی و بیگەیەنینە بەرچاوی خوێنەران.

لەبارەی دەریای تاریکییەکانەوە :

لە کتێبەکەیدا "ناوەڕاست، و جیهانی دەریای ناوین"، فرنان برودوێل ئەو شارستانیانەی کە لە دەوروبەری دەریای ناوەڕاست ژیاون دەست نیشان دەکات، و بەو ووتەیەش دیارییان دەکات کە دەڵێت: "حەوزی ناوەڕاست سێ شارستانی لێکجیاواز، سێ گروپی کەلتووری، سێ چەشنە بیروباوەڕ، و بیرکردنەوە و ژیان، کۆدەکاتەوە، کە لە سێ قەوارەدا بەرجەستە دەبن، بێ کۆتا لە هێز و توانا".

وادەردەکەوێت ئەم پێ ڕاکێشی و تێپەڕاندنە هێزکاری و توانا فراوانانە ئەوە بێت کە ڕێی دابێت بە ساتگەلێکی پەیوەندیگیری و بەیەکگەیشتنێکی دەوڵەمەندتر و تەروبرتر. هەروەها برۆدوێل پێی وایە ئەم شارستانیانە تەمەن درێژن، کە دەڵێت "سێ سەروسیمای کەلتووری خاوەن هێز و توانایەکی بێ کۆتا هەمیشە لە سەردەمانێکی زووەوە دامەزراون، کە سنووری خۆیان و ئەو دەوڵەتانەیان تێپەڕاندووە کە جگە لە کالایەك بۆیان هیچی تریان پێك نەهێناوە، ئەم شارستانیانە تاکە هێزگەلێکن کە خاوەن خودێکی ماوە درێژن، کە دەکرێت بە بێ پچڕان لەڕێگەی وەرچەرخان و قلپ بوونەوەکانی زەمەن و ڕووداوەکانی مێژووی ناوەڕاستییەوە، بەدوویدا بڕۆین".

برۆدوێل کانونی شارستانێتی ناوەڕاست بۆ سێ نموونە دابەشدەکات، بەگوێرەی بۆچوونی ئەو ئەوانیش: شارستانێتی یەکەم: شارستانی ڕۆژئاوایی،

ڕاستتریش شارستانێتی لاتینی یان ڕۆمانی، ئەوەش لە خەملاندنی ئەودا بریتی یە "لەو شارستانێتییەی کە خاوەن بەرگری و بەرهەڵستی توونـدتر بـووە لەنێو شاستانیەکانی تری دەریای ناوەڕاستدا، ئەویش ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی بـووە، بـە ڕۆمای ناوەندیشییەوە کە بە سەنتەری جیهان مایەوە تەنانەت دوای ئەوەشی بووە کاسۆلیکی".

هەرچی شارستانیەتی دووەمە، بریتی یە لە شارستانەتی ئیسلامی، لێرەدا برودوێل وای دەبینێت کە: "ڕۆژئاوا و ئیسلام وەکو پشیلە و سەگ وان و دژایەتییەکی قووڵ کۆیان دەکاتەوە کە لەسەر کێبەرکێ و دژایەتیەو ڕادەوەستێ، بە ووتەی ئەو ئەو دووانە دوو دوژمنی تەواو سەرسەختی یەکترن، یەکەمیان خاچپەرستی داهێنا و لەگەڵی ژیا، لە کاتێکدا دووەمیان (واتە ئیسلامی) (جیهاد)ی داهێنا و لەتەکی ڕۆیشت"، شارستانێتی سێیەمیش بریتی یە لە شارستانێتی یۆنانی، کە ئەمڕۆ ڕووالەت و ئەدگاری بە ڕوون و ڕۆشنی دەرناخات، بەڵکو تەنها پارێزگاری لە جەوهەرەکەی خۆی ئەکات.

ئەم دابەشکردنە، برۆدوێل وای دەبینێت باشترین ڕێنیشاندەرە بۆ کەسێك کە بانگەشە بۆ گفتوگۆی شارستانی دەکات، بۆیە دەڵێت: "جگە لە تۆباوییەکان کەس خەون بە توانەوەی شارستانی و ئاینیەکانەوە نابینێت، ئاینەکان لە شارستانییەکاندا لە هەموو شت زیاتر تایبەتمەند و خاوەن بەرگرین، دیارترین نموونەش لەم بارەوە ڕەتکردنەوەی کاسۆلیکییە بۆ پرۆتستانتییەکان و چاکسازییەکانی کە سەدەی شازدەی تەنیەوە".

برودێل ملدەنێ بەرەو دەستنیشانکردنی شێوەی بەردەوامییەتی و مانەوەی شارستانیەکان، ئەو دەڵێت: "شارستانیەکان بە تێپەڕینی زەمەنە دوای بەدوای

یەك هاتووەكان سەربوردەی ڕێوشوێنی تایبەتی خۆیان هەڵدەگرن، كە دەشێت دەرووپشت و پەراوێزەكانی، بە ئاڵوگۆڕ و گۆڕان، لێی تەرا بین و دوور بكەونەوە، وەلی دڵ لە چەقە ناوەندییەكەدا هەر بە زیندوویی و جێگیری لە زەماندا دەمێنێتەوە، تاكەكان تووشی نامۆبوون دەبن، خیانەت دەكەن و هێڵی سوور دەبەزێنن و تووشی سەرەڕۆیی دەبن، كەچی شارستانیەكان (كە ئەو مرۆڤانەی تێدا دەژی. و) هەر بە جێگیری و چەقیوی دەمێنێتەوە و ناشكرێت سەراپای ئەو شارستانیەتە لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی دی بگوێزنەوە، ئەوەشە وادەكات كە سنوورگەلێك و فەزاگەلێكی كەلتووری سەرسوڕهێنەر لە بەردەوامبوونیدا و لە عاسیبوونیدا لە تێكەڵاوبوون و لێكئالان، دادەمەزرێنێت".

برودوێل، ئەم چەسپاوییەی شارستانی، بە هۆكارێكی گرنگ دەبینێت بۆ ڕەگداكوتینی شارستانی لە ڕابردوویەكی دێرین و قوڵدا. لێرەشدا نموونە دێنێتەوە كە دەڵێت: "هەروەك چۆن شارستانێتی ڕۆمانی لەگەڵ مەسیحدا دەستی پێنەكردووە، ئاوهاش ئیسلام لەگەڵ پێغەمبەر موحەمەددا دەست پێناكات، سەرەڕای ئەوەی كە ئەرسەدۆكسیزم بە دامەزراندنی قوستەنتینییە سەریهەڵنەداوە. كاتێكیش گۆڕان ڕوودەدات و درێژ دەبێتەوە بۆ ئەو قووڵاییانەی كە ئایینەكان دەیسەپێنن، ئەوا شارستانییەكان بەها كۆنەكانی خۆیان ڕەنگا و ڕەنگ و بۆیە دەكەنەوە و لە پێكهێنانی جەوهەرەكانیاندا هەر بەردەوامدەبێت، خۆ شارستانی یۆنانی كە زادەی سەدەی حەوتەمی پێش زایین بوو، لە ڕۆژانی حوكمی ڕۆمانیدا هەرەسی هێنا، كەچی پاشان سەرلەنوێ دوای پێنج سەدە بووژایەوە لەگەڵ بوونیادنانی قوستەنتینیە و هە تا سەدەی نۆزدەش بەردەوامبوو، واتە هەتا هاتنەئارای بەهاگەلێكی خاچپەرستی نوێ بە هاوكاری ئەرسۆدۆكسی ڕووسی و ئەورووپییەكان كە ئامانجی ڕزگاركردنی وڵاتی بەلكان بوو".

شارستانییەکان بەڕای برودوێل " تەنها ئاین نیە و بەس، بەڵکو بریتی یە لە کولتوورگەل و ڕەفتارگەل و دابونەریتگەلێك کە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمانێکی دێرین، هەروەك شارستانیە ڕۆژئاواییەکان داتاشرا و موتوربەکراون پاشان لەسەر شارستانیەتێکی دیکەوە خۆیان دروست کردووە و لە پلەی دووەمدایە، هەروەها ئیسلامیش داتاشین و موتوربەکردنە و ئەمیش لە پلەی دووەمدایە، ڕەنگە بە تەنها شارستانییەتی چینی شارستانییەتێك بێت لە پلەی یەکەمدا، و لە یەکەمەوە دەستی پێکردبێت".

برۆدوێل ئاین لە جەوهەری شارستانییەتدا قووت دەکاتەوە، ئەو وایدەبینێ کە واقیعەکان و ئەزموونەکان، و کولتوورەکانی گوزارشتن لە پێکهێنەری شارستانی، ئەویش "لە واقیعدا بریتییە لە کۆمەڵێك شارستانی لاوەکی کە یەك هێز کۆیان دەکاتەوە و ڕوو لە یەك چارەنووس دەکەن، لە شارگەلێکی ڕۆژهەڵاتدا: قاهیرە یان بەیروت، و جوگرافیاش بریتی یە لەوەی کە هەر لە سەردەمانێکی دوورودرێژەوە ئامادەگی هەبووە بۆ دامەزراندنی ئەم سنوورەی نێوان ئەفەریقای عەرەب و ئەفەریقای مەغریبی، و ئەم نموونەیەش بەڵگەی ئەوە دەداتە دەست کە هەموو شارستانیەتێك جێی ڕێی جوگرافی تایبەت بە خۆی هەیە، کە خەسڵەتەکانی خۆی بەسەر ئەو شارستانیەتەدا دەسەپێنێ و سنوورەکەش دەکێشێ، ئەویش جێی و ڕێیەکە پێداویستییەکانی ئەو مرۆڤە تێر دەکات کە خۆی، پوخت و بێ خەوش و بەبێ وەستان، دروستی کردووە ".

ڕاستە برۆدوێل ئاینی لە پێکهاتەی شارستانییەتی وەك کارکردێکی ململانێبازی هێنایە دەرێ، بەڵام هەروەها واشدەبینێ کە کۆی پێکهێنەرەکانی تر پشکیان هەیە لە ململانێ جیاوازەکاندا، یان دەشیخولقێنن، کە پێی وایە:

"ئاشکرایە شارستانییەکان لە ماوە درێژەکانیاندا واتابەخشێك بوون بۆ واقیعگەلێکی مێژوویی کە بە توندی ڕەگیان لە سنوورەکەدا داکوتیووە، بەڵام لە ماوەیەکی مێژوویی نیمچە کورتدا لەگەڵ ململانێگەلێکی توندوتیژ دا، هەندێکیان دژی هەندێکی تریان، دەست و پەنجە نەرم دەکەن. ئەوەتا ناوچەی ناوەڕاست لە سەدەی شازدەدا پڕیەتی لە نموونەی ئەم جۆرە ململانێیانە".

لەبەرامبەر بارودخی پێکەوە ژیاندا کە ئیسلام بۆ جگە لە شوێنکەوتووانی خۆی ڕەخساندبوو، برۆدوێل وای دەبینێ کە نموونەی ئیسپانی لە مامەڵەکردن لەگەڵ جگە لە کاسۆلیکدا گوزارشتە لە عەقڵێکی ڕەتکەرەوەی (ئەوی دیکە)، نەك تەنیا دەرودراوسێکانی، بەڵکو تەنانەت لەناو خۆیشیدا، ئەوەش لەم حوکمەی ئیسپانیادا ڕوون دەبێتەوە: "جا ئیتر ئیسپانیا لەم ڕەفتارەیدا لەسەر هەق بێت یان ناهەق، ئەمە لە کاتێکدایە کە کۆی مێژوونووسەکان بە تەنگی (مۆریسك)ەوەن، بەڵام پێویستە لەسەرمان بپرسین بۆچی ئیسپانیا ئەوەی بە مۆریسك کرد کە کردی؟ چونکە مۆریسك ڕاستبوویەوە بەڕووی ئەو شارستانیە ڕۆژئاواییەی کە بەسەریاندا سەپێنرابوو، بۆ ڕەتکردنەوەی ئەوانەی لە پەلەقاژەی پارێزگاریکردن لە ئاین و پۆشاك و وابەستە سوازدارییەکانیان دابوون، کە بە جیهانی ئیسلامییەوە گرێی دەدانەوە".

لە بەرامبەردا برۆدوێل وای بۆ دەچێ کە "مەحاڵ بوو ئیسپانیا لە پێکەوە ژیاندا بێتلەگەڵ بنکەیەکی ئیسلامیدا کە لەناوجەرگەکەیدا دامەزرابێت، ئەمەش دداننانێکە بە لێنەهاتوویی و بێ تواناییەکەیدا، بۆیە خۆی لەبەردەم دوو ڕیانێکدا بینییەوە: یان هەڵکەندنی ئەو بنکەیە لە ڕەگ و ڕیشەیەوە، یان پێکەوە ژیان لەگەڵیدا بە مەبەستی تێهەڵکێشکردنی و هەرسکردنی بەشێوەیەکی سەراپاگیر،

دواجار ڕەفتاری ئیسپانی لەنێوان ئەم دوو سنوورەدا، وای بەباشترزانی ئەو ڕێگەیە هەڵبژێرێ کە ڕەگ و ڕیشەیی و ڕادیکاڵییە: دارنینی مۆریسك و دەربەدەرکردنیان لە شارەکان یەکەمجار، لە لادێکان دووەمجار، بەڵام ئەوەی کە ڕوویدا جێ پەنجە و شوێنەواری ئیسلامی لە ئیسپانیا دا نەسرییەوە کە زۆرێك لە توخمەکانی شارستانێتی ئیسلامی پاراوی دەکرد".

برودوێل نموونەیەك لە عەقڵی ئەوروپی دەنوێنێ کە وا لە ئیسلام و پەیوەندی لەگەڵیدا دەڕوانێ کە پەوەندییەکی توندو دژوارە بە ململانێ و زۆرانبازی، ئەمەش پەیوەندییەکی قڵپکردنەوەییە، کاتێك یەکەم قڵپکردنەوە لە بەرژەوەندی ڕۆژئاوا لەسەر دەستی ئەسکەندەری مەکدۆنی دەستی پێکرد، هیلینیزم وەك یەکەم (بە ئەوروپیکردن) بوو بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوین، و تا سەردەمی بێزەنتیش بەردەوام بوو، لە کۆتایی سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیشدا ڕۆژئاوا هەرەسی هێنا، و دەستبەجێ ڕۆژهەڵاتی موسوڵمان و بێزەنتی، واتە ئەو ڕۆژهەڵاتەی کە نەشونماکردنی خۆی بە ئاراستەی ڕۆژئاوای دواکەوتوو و پاشکەوتوو، ڕەوانە دەکرد، بووە میراتگری.

پاشان لە سەردەمی خاچپەرستەکاندا قڵپبونەوەیەکی نوێ دەستی پێکرد، کە لە ڕۆیشتنی مەسیحیەتدا بۆ بازرگانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوین خۆی دەنوێنێ، ئیدی گەشتی هەریەکە لە بازرگانەکان و کونسوڵەکان و پاوانی نێردە زانستی و ئاینییەکان شێوەی داگیرکردنێکی ڕۆژئاوایی بۆ ڕژهەڵات بەخۆوە گرت، پاشان ڕۆژهەڵاتی سەدەی شازدە هات، کەلەگەڵ خۆیدا ڕەشەبای سەرکەوتنی ڕۆژئاوای بەسەر ئیسلامدا، هێنا، کە لەپشتی ڕیسك و بازرگانی و قازانجکردنەوە ڕوویدا-

لەکاتێکدا کە تورکەکان پێویستیان بە پیشەکاران، و بەرگدرووان، و دەریاوان و پسپۆڕەکان لە دروستکردنی کەشتی و پیشەسازی تۆپ و تەقەمەنیدا، هەبوو.

ئەمرۆ جیهان فراوانبووە، ئاشکرایە ململانێش تەنیا ئایدیایەك نیە کە لۆسەر ناوی هێناوە، و تا هنتنگتۆن، و بە تێپەڕین بە برۆدوێلدا، بەردەوام بووبێت، بەڵکو شێوەی ستراتیژییەتێك وەردەگرێت عەقڵێکی سیاسی و دامو دەزگایی هەیە گەشەی پێبدا، و بیکاتە خاچپەرستییەك کە سیاسیەکان پەرەی پێبدەن لە ئێستایەکدا، و جەنگێکی دادوەرانە بە دیدی ڕۆشنبیرە ڕۆژئاواییەکان لە ئێستایەکی تردا. گۆڕەپانەکەش دەریای تاریکییەکان –ناوەڕاست– نییە، بەڵکو هەموو جیهانە، کە لە تاکە شارستانیەتێکدا کەلتوورگەلێکی ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتی دەبینرێتەوە، بەڵام لەمڕۆدا ئەم شارستانییەتە تاکە سەرێکی هەیە، ئەویش ڕۆژئاوایە.

سەرچاوە: ئینتەرنێت

# ئەحمەد نەعیم بابان زادە*

نووسینی :دکتۆر محمد حرب
وەرگێڕانی لەعەرەبیەوە:أومید أبراهیم محمد

١/کاروکردەوەکانی :

هەر لەسەردەمی دەستپێکردنی چاکسازی و تەنزیماتی دەوڵەتی عوسمانی ،واتا لەسەرەتاکانی نیوەی دووەمی چەرخی نۆزدە،جیهانی ئیسلامی تووشی سەرەتاکانی شالآوی بلأوکردنەوەی بیرو فیکری ئەورووپی بۆوە کە ئەویش خۆی لەهزری ی نەتەوایەتی و نەتەوەخوازیدادەبینیەوە ·ئەم فیکرەیەش زیاتر پەرەی سەند بەهۆی پاڵپشتی هەندێ رێکخراوی پیلانگێڕ دژی دەوڵەتی عوسمانی ،بوونی ئەو فیکرەنەتەوەییەلەووڵاتی مسوڵمانان ،کەرەگ و ریشەکەی لەئەورووپابوو ،گەشەی کردوو شوێنکەوتووانی لە زیادبووندابوو ،لەسەرووی ئەوانەشەوە ئەوکەسانەبوون کەلەرۆژئاوا فێربووبوون ،کەبەشەوقەوە ئەو فیکرەیەیان وەرگرتبوو·

سەرکەوتنی فیکری رۆژئاواش لەناو دەوڵەتی عوسمانی دا،بەدامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی تورك بەسەرکردایەتی مستەفاکەمال ئەتاتورك دەرکەوت،کەوا نموونەی بالأی لەرۆژئاواوەرگرت و رەتی ئیسلامیەتی ووڵاتانی رۆژهەلأتی دەکردەوە·

---

٥١ رسول حاول الكركوكلي: دوحة الوزراء ص٢٧٧ ومرآة الزوراء ص٦١ وتاريخ جودت ج١١ ص٢٨-٢٩.

٥٢ عنوان المجد ص١٠٠.

٥٣ المصدر نفسه والصفحة.

٥٤ المصدر نفسه والصفحة.

٥٥ المصدر نفسه ص١٠١.

٥٦ المصدر نفسه ص١٦٨.

٥٧ المصدر نفسه والصفحة.

٥٨ عبد العزيز نوار: المصالح البريطانية في أنهار العراق ١٦٠٠- ١٩١٤، ص٦٧.

٥٩ وقفية أبي بكر الباجه جي على مسجد الصياغ ببغداد (مخطوط)، إبراهيم الدروبي: اخبار قضاة بغداد ص٢٠١ (مخطوط).

٦٠ وقفيات زكريا الخضيري على مسجده، مؤرخة سنة ١٢١١هـ.

٦١ وقفية علي جلبي الشطي على ذريته، مؤرخة ٢٤ ربيع الأول ١٢٢٧هـ.

# پرسیار و وەڵام دەربارەی مێژووی کورد

پ.د. أرسن موسى رشيد
د. محمد عبدالله کاکە سوور

میرنشینی هەزبانی :

پ١: کەی کورد یەکەم شۆڕشی دژی دەوڵەتی عوسمانی بەرپا کرد؟

و: لەسەردەمی فەرمانڕەوایی حەمدانییەکان لە موسڵ کورد شۆڕشیان بەرپا کرد دژی زۆرداری حەمدانییەکان و عەباسییەکان، بەسەرکردایەتی محەمەد بن بلال هەزبانی.

پ٢: کەی هەزبانییەکان بۆ ئازەربیجان چوونە؟

و: پاش شکستی شۆڕشی هەزبانییەکان دژی حەمدانییەکان و عەباسییەکان کە دەکاتە سەرەتای سەدەی چواری کۆچی و لەوێش دەستیان کرد بە دروستکردنی میرنشینی کوردی وەکو میرنشینی ڕەوادی، سەلاحەدینی ئەیوبی لە ڕەوادییەکانە.

پ٣: کەی هەزبانییەکان هاتوونەتە هەولێر؟

و: پاش شکستی شۆڕشەکەیان دژی حەمدانییەکان و عەباسییەکان بوونە دوو بەش، بەشێکیان چوونە ئازەربیجان و بەشێکیشیان هاتنە هەولێر، لە هەمان کات لە سەردەمی چواری کۆچی کە میرنشینی هەزبانییەکانیان لە هەولێر دامەزراند.

پ٤: بەناوبانگترین میری هەزبانییەکانی هەولێر کێ بوو؟

و: بەناوبانگترین و گەورەترین میری هەزبانی ئەبو ئەلهیجاء موسک هەزبانی ناسراو بە میری گەورە (الامیر الاکبر)، ئەم نازناوەی لەلایەن خەلیفەی عەباسییەوە پێدراوە، و هەروەها لەلایەن سەلجوقیەکانیشەوە بەم نازناوە ناسرا بوو، ئەم میرە لە سەرەتاکانی سەدەی شەشی کۆچی فەرمانڕەوایەتی کردووە، کە وادیارە لە سەرچاوەکان خەلیفەی عەباسی و سوڵتانەکانی سەلجوقی دانیان پێدا ناوە، کە ئەمانە لەو کاتدا لە هەرە زلهێزەکانی جیهان بوونە.

پ٥: ئایا پەیوەندی هەزبانییەکانی هەولێر لەگەڵ عەباسییەکاندا چۆن بووە؟

و: پەیوەندی نێوانیان بە گوێرەی سەرچاوەکان باش بووە، وا دیاریشە خەلافەتی عەباسی دانی بە هەزبانییەکاندا ناوە و میری هەزبانی ئەبو هیجاء هەزبانی خۆی و سوپاکەی بەرگری لە خیلافەتی عەباسی کردووە دژی سەلجوقیەکان.

پ٦: ئایا هەر هەزبانییەکان لە ماوەی سەدەی پێنج و شەشی کۆچیدا فەرمانڕەوایەتی هەولێریان کردووە؟

و: سەرچاوەکان بۆمان دەردەخەن هەزبانییەکان کێبڕکێکەری گەورەیان هەبووە لەگەڵ هۆزێکی تری گەورە بەناوی حەکیمیە کە بۆماوەیەك توانیان هەولێر لەژێر دەستی هەزبانییەکان دەربهێنن، بەڵام هەزبانییەکان توانیوویانە دووبارە هەولێر بگێڕنەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.

پ٧: ئایا هەزبانییەکان هیچ لایەنێکی شارستانیان لە هەولێر بەجێماوە؟

و: بەگوێرەی سەرچاوەکان ڕوون نیە کە هیچ لایەنێکی شارستانیان لە هەولێر بەجێ هێشتبێت، وەك کۆشك و مزگەوت بۆیە پێدەچێ زیاتر جەختیان لە قەڵای هەولێر کردبێت نەوەك خوارەوەی قەڵات بۆیە پێدەچێت کە پتر میرنشینێکی سەربازی بووبێت.

پ٨: ئایا حوکمڕانی هەزبانییەکان تاکو کوێ دەڕۆیشت؟

و: بەگوێرەی سەرچاوەکان بەدیارناکەوێ تا کوێ بووە، بەڵام نزیك ئاکرێ بووە، چونکە لە ئاکرێ میرنشینێکی تر هەبووە بەناوی عقر الحمیدیە، لەلایەکی تر تاوەکو دەشتی هەولێر بووە و لەلای کەرکوکیش نەگەیشتۆتە کەرکوك، بەڵام لەلای ناوچەی شا خاوی تاکو شارەزوور درێژ بۆتەوە چونکە لەناوچەی شارەزوور میرنشینی تری کوردی هەبووە.

پ٩: ئایا میرنشیکی هەزبانی لەسەر دەتی کێ لەناوچووە؟

و: عیمادالدینی زنکی هەولێری لەژێر دەسەڵاتی هەزبانییەکان دەرهێنا و هەولێری دایە دەستی عەلی کوچك، کە یەکێك لە سەرکردەکانی سوپاکەی بوو، ئەویش میرنشینی ال بکتکینی لە هەولێر دانا، کە میرێکی زۆر ناودار لەو بنەماڵەیە پەیدابوو، موزەفەرەدینی کۆکبوری یە.

پ١٠: ماوەی فەرمانڕەوایی میرنشینی هەزبانی لە هەولێر چەند بوو؟

و: نزیکەی هەشتا ساڵ بووە.

# مەڵۆیەك لە خەرمانێك
# ( القبائل وزعامات القبلية الكردية في العصر الوسيط )
# لە تای تەرازووی رەخنەدا

فوئاد حەسەن (فوئاد رەوەند)
قوتابی قۆناغی چوارەمی مێژوو

ئەم وتارە ئاماژەیەکی سەرەتاییە بۆ ئەم بەرهەمە تەنیا یازدە دێر لە توێژینەوەی بەڕێز پرۆفیسۆری یاریدەدەر (د. زرار سدیق تۆفیق) لەژێر ناونیشانی (ألمموی، مَموی، مامویی)، لەخۆدەگرێت، پاڵنەری سەرەکیم بۆ ئەم نووسینە تەنیا راستکردنی هەڵەکانە، چونکە توێژەری بەڕێز خاوەن پلەیەکی زانستیە. قوتابیانی مێژوو بەدڵنیایی سوود لەم بەرهەمە وەردەگرن و بێ رەچاوکردنی رێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی دەکەونە هەمان هەڵەی توێژەر.دووبارە بونەوەی هەڵەش لە ئایندە رێگردەبێت لە بەردەم چاککردن

پەلەکردن لە دەرچوونی ئەم بەرهەمە دیارە لەو هەڵە رێنووسی و زمانەوانیانە، کە لە دەقەکە هەیە و عەرەبیەکەی رەوان نییە. سوود وەرگرتنی توێژەر لە (٣٠) سەرچاوەی فارسی بێ ئەوەی فارسی بزانێت هیچ ئاماژەیەك بۆ وەرگێرە فارسیەکەش لە ئارادانییە بەمەش گلەیی وەرگێڕانیش دەخرێتە ئەستۆی

ئەو، هەرچەند ئەم خاڵانە لە سنووری ئەم وتارە نییە. لە دوای وەرگێڕانی کوردی ئەم توێژینەوەیە دەبوا بەڕێز د. زرار هەڵەکانی چاپی عەرەبی راست بکات نەك مۆڵەتی هەڵەی تر بدات.

ناچارم بەشێك لە دەقەکە دەخەمە روو، کە زیاتر رۆشنایی بخەمە سەر باسەکە A- دەقی عەرەبی: "وينتمي بابا اردلان مؤسس امارە اردلان إلى قبيلە ماموبي، كما هناك قبيلە پالپە باسم مماكويە ڨ لرستان الكبرى والنازحە من جبل السماق ايجاً وقبيلە رابعە باسم علي ممايي من قبائل لرستان الصغرى" (كزيدە، ص٥٤٠-٥٥٠)[١].

B- دەقی کوردی:"(بابا ئەردەلان)ی دامەزرێنەری میرنشینی ئەردەلان سەربەم هۆزەی دوایی بووە. (كلوديوس جيمس ريج، رحلە ريج الى العراق، ص)، دیسانەوە هۆزی سێیەمیش بەناوی ماماکۆیی لە لورستانی گەورە هەیە، ئەوانیش لە چیایی سماقەوە هاتوونە، لە لورستانی بچووکیش هۆزی چوارەم هەیە، بەناوی مەمایی". (تاریخ كزيدە، ص ٥٤٠-٥٥٠)[٢].

لە دەقی عەرەبی توێژەر هەڵەی رێنووسی هەیە (تاريخ گزيدە)ی بە (تاريخ كزيدە)ی نووسیوە وەرگێڕی کوردیشی خستۆتە هەمان هەڵە، کەچی لە دەقی عەرەبی و لەلاپەڕە (٧) ناوی ئەم پەرتووکە بەڕاستی نووسراوە، کەوابوو کێشە نەلەفۆنتە بەڵکو لەپەلەکردن لە هەڵە چنیدایە، وەرگێڕی کوردیش سەرچاوەیەك دەخاتە بەردەست کەلەدەقی عەرەبی بوونی نییە بێ ئاماژە کردنێك لەپەراوێز، کە ئەم سەرچاوەی بۆ بەکارهێناوە، ئۆباڵی ئەم هەڵەیە نازانم بخەمە ئەستۆی کێ توێژەر یان وەرگێڕ.

دەبوا د. زرار سدیق پێناسەی (جبل السماق) و (لرستان الکبری) و (لرستان الصغری) بکا، ئەگەر قوتابیەك ئەمەی کردبا بەڕێزیان بەهیچ شێوەیەك لێی قبول نەدەکرد، توێژەر بەخوێنەر دەڵێت کە بابە ئەردەلانی دامەزرێنەری میرنشینی ئەردەلان سەر بەو هۆزانەیە کەباسی کردوون سەرچاوەشی (تاریخ گزیدە)یە، دوودانە لەم پەرتوکە لەبەردەستمە یەکەمیان بە ساخکردنەوەی (د. ئەدوارد براون) ڕۆژهەلات ناسی بەریتانیە، دووەمیان بە ساخکردنەوەی (د. عەبدولحوسێن نەوایی) توێژەرێکی ئێرانیە بە هیچ شێوەیەك باسیان لە بابە ئەردەلان نەکردووە کە سەربەهۆزی مماکویەوممایی بێت، جا نازانم بەڕێزیان چۆن گەیشتۆتە ئەو رایە؟

بەشێك لە سەرچاوەکانی بەردەستم دەخەمە روو، کە زۆربەیان هاوڕان کە هۆزی مامۆیی لەو سەردەمەیکە ئەو باسی دەکات و ئەردەلان هیچ پەیوەندیەکیان پێکەوە نییە:

١- مەلا محەمەدی شەریفی قازی نووسییەتی: لە دوای باپیرانی، مەئمون بەگ کوڕی بەهلول دێتە سەر دەسەلات، کە دواتر وەچەکانی بە مەئمونی ناسران ئەم مەئمونیە لەناوی ئەو وەرگیراوە.[٣] ئەمە بەڵگەیە کەناوی میرێك بوویتە نازناوی کوڕەکانی.

٢- نووسەرێکی نەناسراو نووسیتی: بۆیە هۆزی ئەردەلان بە مامۆیی ناسراوە چونکە وەچەی مەئمون بەگن.[٤]

٣- ماهشەرەفخانم (مەستوورە) لەم بارەوە نووسیتی: چونکە مەئمون بەگ میرێکی دادپەروەر و بەردەوام لە فراوانخوازی بووە، لەبەر ناوبانگی ئەو هۆزی ئەردەلان تا ئەمڕۆش بە مەئمونی دەناسرێن.[٥] ئەم سەرچاوەیە لە هەولێر لە چاپدراوە دوو ساڵ بەر لە توێژینەوەکەی د. زرار سدیق، ئالێرە بەڕێزیان بیانووی نییە کە سەرچاوەی لەبەردەست نەبووە.

٤- میرزا شوکرڵڵای سنەیی نووسیتی: لەبەر ئازایەتی، لێهاتوویی و لێزانی مەئمون بەگ هۆزی ئەردەلان بە مەئمونی ناسران. مامۆ لە کوردی سووککراوی ناوی مەئمونە.[٦]

٥- دیبلۆماتکارێکی بەریتانی کە لە (١٨٢٠ز) سەردانی ئەمانوڵڵا خانی گەورەی ئەردەلان (١٧٩٩-١٨٢٤ز) کردووە، لەدوای پرسیار لە میرزادەکانی ئەردەلان سەبارەت بە رەچەڵەك و ناویان نووسیتی: بنەماڵەکەشیان ناوی مامولییە (لەوانەیە مامولی هەڵەی چاپ بێت و مامویی بێت)، کە لە راستیدا زۆر کۆنن، بەڵام لەبەر ئەوەی (گوڕان)ن... ناوی ئەردەلان لە بنەچەدا بەکەسێکی بەناوبانگی بنەماڵەکەوە ناونراوە.[٧]

٦- یەدوڵڵای رەوشەنی ئەردەلان نووسەر و میرزادەی ئەردەلانی نووسیتی: مەئمون بەگ کە پێی دەگوترا مامۆ لە (٨٦٢ك) هاتە سەر دەسەڵات، بە وەچەی ئەو گوتراوە مامۆیی.[٨]

٧- خاتوو شرین ئەردەلان نووسەر و میرزادەی ئەردەلانی نووسیتی: لەماوەی درێژ خایەنی فەرمانڕەوایەتی مەئمون بەگی یەکەم (٨٦٢-٩٠٠ك) ئاسایش و

ئاشتی پێشکەوتنی ئابووری لە میرنشینەکەی بەرچاو بوو، گەیشتە پلەیەك لە شکۆداری، کە لەدوای ئەو فەرمانڕەوایانی ئەردەلآن بە مەئمونی یان مامۆیی بناسرێن، واتە وەچەی مەئمون.[9]

سەرنجی خوێنەر بۆ راستیەکانی سەرەوە رادەکێشم کە ئەردەلآنیەکان هیچ پەیوەندیان بە هۆزی مامۆیی و هاوشێوەکانی نییە، بەڵکو لە کورتکراوەی ناوی مەئمونی باپیرەیان هاتووە، سەرنجی بەڕێز د. زرار سدیق بۆ بەرهەمەکەی (د. جەلیل جەلیل) رادەکێشم کە ئاماژە بە هۆزی مامۆیی کردووە، کە ئەم مامۆیانە یەکێکن لە (١٢) تیرەی هۆزی راوەندی لە رواندز.[10] کە دەبوا سوود لەم سەرچاوەیە وەربگرێت کە بەباسەکەی ئەو پەیوەندی هەیە

بۆ درێژ نەبوونی ئەم وتارە هەندێك سەرچاوە و ژێدەری ترم پشتگوێ خست، چونکە گرنگ گەیاندنی مەبەستە هیوادارم ئەم رەخنەیەم بە دڵێکی فراوان لەلایەن توێژەر بێتە وەرگرتن و ئامادەم گشت سەرچاوەکان بخەمە بەردەستی بەمەبەستی چاککردنی هەڵەکان.

سەرچاوەکان:

١- د.زرار صديق توفيق، القبائل والزعامات القبلية الكردية في العصر الوسيط، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، (اربيل: ٢٠٠٧)،ص ١٦٣.

٢- د. زرار صديق تۆفيق، هۆز و دەسەلاتە هۆزەکییە کوردییەکانی چاخی ناوەڕاست، و.ئیدریس عەبدوڵلا مستەفا، دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی، (هەولێر:٢٠١٠)، ل٢٢٦.

٣- زبده التواريخ، به كوشش محمد رئوف توكلي، انتشارات توكلي، (تهران:١٣٧٩هـ.ش) ص١٤.

٤- نويسنده ناشناس، تاريخ كرد، كتابخانه ملي ايران-تهران، نسخه خطي شماره ٢٢١٣/ف،و١.

٥- تاريخ الاكراد، ويرايش جمال احمدى اين، انتشارات اراس، (اربيل:٢٠٠٥)، ص٣٤.

٦- تحفه ناصرى، مقابله و تصحيح وحواشي وتعليقات دكتر حشمت الله طبيبى، مؤسسه انتشارات امير كبير، چاپ دوم، (تهران: ١٣٧٥هـ.ش)، ص ٩٥.

٧- كلوديوس جيمس ريچ، گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، و. محەمەد حەمە باقی (تەورێز:١٣٧١هـ.ش) ل٢٢٤.

٨- محمد امين زكي بيگ، زوبدة تاريخ كردو كردستان، ترجمه يدالله روشن اردلان، ضميمه زير خاكستر تاريخ، انتشارات توس، (تهران:١٣٨١هـ.ش)، جلد دوم، ص ٣٢١.

٩- خاندان كرد اردلان در تلاقى امبراطورى هاى ايران و عثمانى، مترجم مرتضى اردلان، نشر تاريخ، (تهران: ١٣٨٧هـ.ش)، ص٤٢.

١٠- كردهاى امپراتورى عثمانى، ترجم صلاح الدين اشتى، نشر پانيذ، (تهران:١٣٨١هـ.ش) ص٢٥.

# هەڵوێستمان چۆن بێت لە هەمبەر ڕۆژهەڵاتناسی

د. حکیم احمد
زانکۆی سەلاحەدین

ڕۆژهەڵاتییەکان هەڵوێستی جیاجیایان هەیە بەرامبەر کاری ڕۆژهەڵاتناسی کە هەڵقوڵاوی ئەو بیرکردنەوە و تێڕوانینەیە کە لەلایان گەڵاڵە بووە. دەکرێ بەگشتی دوو جۆر هەڵوێستی سەرەکی دەستنیشان بکەین:

١- بەتەواوی ڕۆژهەڵاتناسی ڕەتدەکاتەوە و کاری **ڕۆژهەڵاتناسان** بە دوژمنکارییانە وەسف دەکات و **هیچ ئیجابییەتێکی تێدا** نابینێت و وا سەیری دەکەن کە **تەنها ئامرازێکە (ڕێگایەکە) لە ئامرازەکانی** ئیستیعماری ڕۆژئاوایی **تا جێی خۆی لە ڕۆژهەڵات** بکاتەوە و مەرامەکانی پێ جێبەجێ بکات.

ئەوانەی ئەم تێڕوانینەیان هەیە زیاتر ئەو کەسانەن کە لە ڕوانگەیەکی ئاینییەوە لە مەسەلەکە دەڕوانن و پەروەردە و دەرچوی خوێندگە و قوتابخانە ئاینییەکانن، بۆیە هیچ پەراوێزێکیان بۆ لێکدانەوەی ئیجابیاتەکان نەهێشتۆتەوە.

٢- هەڵوێستێکی میانڕەوانە دەنوێنێ لە کاری ڕۆژهەڵاتناسی و هەموو ئەو جۆرە کارانە بەیەك چاو سەیر ناکات، بەڵکو لە ڕوانگەی هەڵسەنگاندنی زانستیانە دەڕوانێتە بەرهەمی ڕۆژهەڵاتناسان و هەندێکیان ئیجابییانە هەڵدەسەنگێنێ

کە لە ڕوانگەیەکی زانستی ئەنجامدراون و دوور لە بەرژەوەندی تایبەتی و کاری ئیستیعماری و ڕەگەزپەرستانە.

بەڵام لەهەمان کاتدا ئەوەش ناشارێتەوە کە ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژهەڵاتناسان لەبەر هۆکاری تری دوور لە زانستی و ئەکادیمی نووسیوویانە و بەشێکن جیاناکرێنەوە لە کاری داگیرکاری و دوژمنکاری و ڕەگەزپەرستی ڕۆژئاوا بەرامبەر ڕۆژهەڵات. ئەو نووسەرە ڕۆژهەڵاتیانەی کە ئەم هەڵوێستەیان هەیە، وەکو: (عەباس مەحمود عەبدولقادر، مالك بن بنی).

- چۆن دەتوانین هەڵوێستێکی زانستییانە بەرامبەر ڕۆژهەڵاتناسی وەربگرین؟

سەرەتا چەند خاڵێك هەیە پێویستە لەبەرچاو بگیردرێت بەرلەوەی بزانین کە چ هەڵوێستێك پێویستە بەرامبەر ڕۆژهەڵاتناسی بنوێنین چونکە پێویستە دان بنێین بە بوونی ڕۆژهەڵاتناسی و گرنکییەکەی کە یەکجار زۆرە، چونکە:

١- **ڕۆژهەڵاتناسی لە ئێمە دەکوڵێتەوە وەك ڕۆژهەڵاتی، و بایەخێکی زۆر دەداتە بابەتە جۆراوجۆرەکانمان بێ ئەوەی ڕای ئێمەی تێدا بێت.**

٢- ڕۆهەڵاتناسی کاریگەری هەیە لەسەر کۆی هزر و بیرکردنەوەکانمان و بەشێك لە ڕەفتارەکانیشمان پێکدەهێنێ.

٣- ڕۆژهەڵاتناسی ئێمە بە جیهانەکەی تر دەناسێنێ، بەو ڕێگەیەی کە حەز دەکات و بەو ئامرازانەی کە هەڵیان دەبژێرێ.

٤- ڕۆژهەڵاتناسی بەشدارە لە بنیاتنانی هزری مرۆڤایەتی و لەڕێڕەوی ئەم هزرە بە هەموو لایەنە مێژوویی و ئاینی و کۆمەڵایەتی و لایەنەکانی تریشەوە.

٥- ڕۆژهەڵاتنایی هەوڵدەدات کە بەسەرماندا زاڵ بێت، و لەڕێگەی پێکهاتە هزرییە جیاوازەکانی لەئازادی بێ بەشمان بکات.

- بە چ شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ ڕۆژهەڵاتناسی (ڕۆژئاوا) بکەین؟

پێویستە مامەڵەیەکی لۆژیکییانەمان لە هەمبەر ڕۆژهەڵاتناسی هەبێ و وەکو کاردانەوەیەك لەبەرامبەریدا هەڵوێستمان نەبێت، بەڵکو ئەم هەڵوێستە هەڵقوڵاوی چەند بنەمایەکی ڕێك و پێکی ڕوون و ئاشکرا بێت، کە بە ئاسانی بخوێندرێتەوە هەروەك چۆن ئێمە ناتوانین و ناشبێت چاو لە ئاست ڕۆژهەڵاتناسی بنوقێنین و فەرامۆشی بکەین، لەهەمان کاتدا نابێت وەکو دیاردەیەکی تەندروست سەیربکرێت و وەك جۆرێك لە جۆرەکانی ئاڵوگۆڕکردنی ز انیاری و بابەتە هزرییەکان یاخود وەك جۆرێك لە ڕکابەری کلتووری و شارستانی، بەڵکو وادەخوازێ مامەڵکردن لەگەڵی بەهەمان ئەو بایەخ و گرنگی پێدانەبێ کە ڕۆژهەڵاتناسان گرتوویانەتە بەر و کاری بۆدەکەن بەڵام بەشێوازێکی ڕاست و تەندروست و زانستییانە دوور لە هەموو پێشینە و گرێیەکی دەروونی و کۆمەڵایەتی و هزری و هەموو ئەو کاریگەرییەنەی لەسەری هەیە.

هەروەها پەسەند نییە کە ڕۆژهەڵاتییەکان خۆیان بەوە سەرقاڵ بکەن کە وەڵامی هەر بەشێك یان لایەنێکی بچووك بدەنەوە کە ڕۆژهەڵاتناسەکان دەربارەی ڕۆهەڵات باسیان لێوەکردووە، بەڵکو وا باشترە ئەو بوارانەی کە ڕۆژهەڵاتناسان لێی دەکۆڵنەوە پۆلێن بکرێن و بەپێی پسپۆری کەسانی شارەزا و تایبەتمەند لێکۆڵینەوەی لەسەر ئە نجام بدەن، بەمەش هەوڵ و کۆششەکان بە ئاراستەیەکی تەندروست ئاراستە دەکرێن و کاتێکی زۆریش دەگەڕێتەوە.

هەروەها پێویستە گرنگی بدرێت بە کاری وەرگێران لە زمانە ڕۆژئاواییەکانەوە بۆ زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان و بەپێچەوانەیشەوە، بۆئەوەی هەردوو لا زۆرترین زانیاری دەربارەی یەکتر کۆبکەنەوە، کە دەبێتە ئەو بناغەیەی هەر لێکۆڵینەوەیەکی

زانــستی لەســەر دابمــەزرێ. هاوکــات یــەکتر ناســین و شــارەزابوون لــە نیــاز و مەرامەکانی ڕۆژهەڵاتناسان ڕۆڵێکی بـاش دەبینـێ لـە مامەڵـە کردنێکی بابەتیانـە لەگــەڵ واقیعــدا دوور لــە دەرکردنــی حــوکم و بڕیــاری گــشتگیر و ســەرپێیانە و هەڵچووانە، چونکە ئەوەی تێبینی دەکرێ زۆر لـە نووسـەرە ڕۆژهەڵاتییـەکان بـەم نەفەسە کاردەکەن ئەمەش دەبێـە نـا تێگەیـشتنی زیـاتر و پێچەوانەی نووسینە زانستییەکان و هەردوو لا (ڕۆهەڵات و ڕۆژئاوا) باس دەکەن پابەندن پێیانەوە بۆیـە پێویستە وتوێـژ و ڕووبەڕووبوونـەوەی زانـستی ببێتـە بناغـە لـەنێوان هـەردوو لا و بۆئەوەی هـەموو ڕۆژهەڵاتناسـان نەخرێنـە نـاو یـەك خانـەوە و بەیـەك چـاو سـەیر نەکرێن.

سەرچاوەکان :

١- ابو الحسن الندوي، الاسلاميات بين كتابات المستشرقين و الباحثين المسلمين.
٢- ادوارد سعيد، تغطية الاسلام.
٣- د. محمد فتح الله الزيادي، الاستشراق اهدافه، و وسائله.
٤- مجموعة باحثين، الاستشراق بين دعاته و معارضيه.

# دۆزینەوەی شوێنەوارێکی زۆر لە سماقوڵی

عبدالرقیب یوسف

دۆڵـی سمـاقوڵی دریـژی (١٦کـم)ە و دەکەوێتـە بـاکوری کۆیـە لـەنێوان زنجـیرە چیای سـەفین لـە باکورەوە و زنجیرە چیای (بنـەباوێ) و(باواجی)لە باشورەوە (وێنـەی دیمـەنی سمـاقوڵی) دۆڵـی سمـاقوڵی فراوانـە و زەوی و زار و بـاخ و بێستانێکی زۆری تێدایە. (٢٨کم)لە دەربەندی گۆمەسپانەوە دورە و لە قەڵای هەولێرەوە بە (٥٩کم) دورە. لەم دۆڵە دا سێ گوند بەناوی سماقوڵی یەوە هەیە (سماقوڵی گەلی) لە ڕۆژهەڵات کە بەرزیی لە ئاستی ڕووی دەریـا (٧٣٢)مـەترە و (سماقوڵی گرتك) لـە ناوەڕاست و (سمـاقوڵی سەروچـاوە) لـە بـاکوری ڕۆژئـاوا. دێ (سێنان) لە ڕۆژئاوای یەکەمیانە و دێ (کرۆژ) لە باشوری ڕۆژئاوایەتی کە ئـاوێکی زۆر لـە (ئەشـکەوتی کـرۆژ) هەڵـدەقوڵێ و لەگـەڵ ئـاوی سمـاقوڵی سەروچاوە و کانیـە کـانی دیکـە ڕوبـاری سمـاقوڵی پێکـدێت. نـاوی ڕوبارەکـە دەبێتـە ڕوبـاری (هیـزۆپ) پـاش تێکـەڵ بـونی ئـاوی دۆڵـی هـیران و نـازەنین . هیـزۆپ دەکەوێتـە سـەر ڕێگـای سلێمانی- ڕانیـە و دەگاتـە ڕوبـاری زێ بچوك. بەرزترین چیا لەپشت سماقوڵی گەلی (شاخی ئاوەگرد)ە کە لەباکورەوە تا چیای ئـاکرێ و لـە ڕۆژهەڵاتـەوە تـا شـاخی قەنـدیل و شـاخەکانی نێـوان پـشدەر و سەردەشتی لێوە دیارە هەروەها شاخی پیرەمەگرون و بازیان و بەشەو کارەبای هـەولێر بەدەردەکـەوێت. هـەروەها(ئـاوەگرد)ی گـەردن بڵنـد دیمـەنێکی زۆر دڵرفێنـی هەیـە. لەمێـژووی کۆن و لەسـەدەکانی ناوەڕاسـتدا سمـاقوڵی دەکەوتـە

سەر ڕێگای بازرگانی گشتی نێوان ئێران و کوردستانی باشور و سوریا. ڕێگا لە ئێرانەوە دەهاتە ناوچەی سەردەشت و دەشتی پشدەر و دەشتی بیتوێن و سماقوڵی و دەربەندی گۆمەسپان لە ڕۆژهەڵاتی هەولێر بە (٣١كم) کە دوایین دەربەندی سەر ئەم ڕێگایە بوە کە باج لەوێ لە کاروانەکان وەردەگیرا پاسەوانی کردنی لە دەستی عەشیرەتی خۆشنا و گەردیدا بوە، ئێستا لە دەربەندەوە تا سماقوڵی خەڵکەکەی خۆشناون تا ئەم چەند ساڵەی دوایی شوێنەواری چەند بینایەك لە پشت دەربەند مابوو لەوانەیە شوێنی خان و باج گرەکەبێت کە بە شۆفڵ تێکیان داوە، و بە دەربەندی (قەرابولی) دەزانرێت بەپێ ساغ کردنی د.زرار صدیق و بەناوی (قەرابولی) لە تورکمانێکی سەلجوقی لە عەشیرەتی (سەلغور) ناوکراوە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی یازدەیەمدا شەڕی لەگەڵ میری شارەزوور سوهراب(سرخاب)ی کوڕی بەدر لە بنەماڵەی ئانازی(عنازی) کردوە وە لەو ڕووداوانە دەزانرێ کە ناوچەی کۆیە و سماقوڵی لە دەستی سوهراب دابوە وەك بەدرێژیم نوسیوە لە کتێبەکەمدا(حدود كردستان الجنوبية تاريخياً و جغرافياً خلال خمسة آلاف عام) لە بابەتی (تورکمان)دا ناوی دەربەند قەرابولی و باجگرەکەی هاتوە لە کتێبی (مسالك الأبصار) ی(القاضي شهاب الدين إبن فضل الله العمري-محمد بن يحي) لە مێژوونوسانی میسر کە لە (١٣٤٩ز)کۆچی دوایی کردوە ل ١٧١ چاپی (مركز زايد للتراث والتاريخ). ئەم ڕێگایە لە هەولێر دەگەیشتە درێژترین ڕێگای ووشکانی لە ئاسیا دا کە ناسراوە بە ڕێگای شاهانە (الطريق الملكي) کەلە(چین) ەوە دەهات و تا ئەوروپا و میسر دەچو. بەم شێوەیە سماقوڵی دەکەوتە سەر ڕێگایەکی بازرگانی گرنگ کە لە هەولێرەوە تا بناری شاخی کێلێ لە ڕۆژهەڵاتی قەڵادزێ ڕێگاکە ئاسان بوو هەڵگەڕان بە شاخی بەرزەوە نەبوە لەبەر ئەمە پاشای ئاشوری (شلمانصر)ی سێیەم ساڵی

(٨٥٧پ.ن) لە ڕێگای سلماقوڵی یەوە چوە بۆ وولاتی (بونائیس) واتە پشدەر لە ٢٠٠٩ شاری (بونائیس-بۆنەسێ مان دۆزی) و شالاَوی بردۆتە سەر (مەننا) یەکان لە ناوچەی موکری و هەروەها ساڵی (٧١٤پ.ن) پاشای ئاشوری (سەرجونی دووەم) لە ڕێگای سماقوڵی یەوە ڕۆشتوە لە شالاَوەکەیدا بۆ سەر (مەننا)، و دەوڵەتی (ئۆرارتۆ) لە (وان) و پاش سماقوڵی لە دەربەندی ڕانیەوە تێ پەڕیوە و ڕێگای دەربەندی فراوان کردوە لە شاخی (سیمریا) واتە کێوەڕش واتە شاخی سەلکێ (سلق) لە سەرچاوەکانی کاتی ئیسلام دا بەپێ ساخ کردنەکەمان وەك بلاَومان کردوە لە گۆڤاری (ڕێنوێن) ژمارە (٥) ساڵی ٢٠١٠ وەها گرنگی ڕێگای سماقوڵی و شوێنەکەی دیار دەبێت لە مێژووی کۆن و لە سەدەکانی ناوەڕاستدا. بەپێ بۆچونم بەشێکی زۆر لە شوێنەوارەکانی سماقوڵی هی کاتی ئاشوریە و سماقوڵی وەك قۆناغێك بوە لەسەر ئەم ڕێگایە و دەوڵەتان بایەخیان پێداوە و قایمیان کردوە بە شورە و بورج و قەلاَت و سەربازگەی گەورە بۆ پاراستنی کاروانەکانی بازرگانی و ڕێبواران.

لە (تاريخ الكرد و كردستان ل ٨٧) هی مێژوونوس محەمەد أمین زەکی ناوی (سماکی) هاتوە لەنێو ناوی جێگاکانی ولاَتی(لۆلۆ) یەکان لەسەدەی نۆیەمی پێش زاین و دەمێك بوو ئەمەم دیبو و هەستم دەکرد سماقوڵی بێت بەلاَم یەکێکی دیکە بوە ئیتر لە هەشتاکانەوە بەنیاز بووم بیبینم و بزانم چ شوێنەوارێکی کۆنی لێ یە و هەروەها بچم بۆ سەر شاخی ئاوەگرد جێگای شەڕی عوسمان پاشای محەمەد پاشای کۆیە لە میرانی سۆران (نەك میرانی بابان) لەگەڵ هێزی سلێمان پاشای والی بەغدا لە ساڵی(١٧٥١) تا وێنەی شوێنی شەڕەکە بگرم. لە شەرەفنامەدا لە ل (٣٥٤-٣٥٦) سماقوڵی بەناوی سماقلق و(سوماقلق) و (سوماقلو) یەوە هاتوە. شەرەفخان نوسیویەتی

(پیربـوداق)ی کـوڕی شـاه عـەلی لـەمیرانی سـۆران سمـاقلو لـە دەسـتی تـیرەی (نیلخـاص) ی سـەر بـە قزلباشـی دەرکـرد. واتـا دەوڵـەتی صـەفەوی و لـەنیوەی یەکـەمی سـەدەی شـازدەیەمدا. نـاوی ئـەو تیرەیـە لـە دەستنوسـی شـەرەفنامە دانـەی کتێبخانـەی بودلیـان لـە زانکـۆی ئۆکـسفۆرد ژمـارە(٣١٢) بەشـێوەی (سلخاص یان بیلخاص) یش هاتوە.[١]

هەوروەها نوسیویەتی میر سیف الدین کوڕی میر حسێن کوڕی میر سیف الدین کوڕی پیر بوداق (سنجاق) ی (سوماقلق)ی خستە ژێـر دەسـتی خـۆی کـەهی بـاو باپیری بو. لە وشەی (سنجاق) دەزانرێ کە سماقوڵی لە نیـوەی دوەمـی سـەدەی شـازدەدا قـەزای ئـەو ناوچـەیە بـوە و تـا ئـەو کاتـەش گـرنگ بـوە. بـەلاّم پـاش سەدەی شازدەیەم نەمزانیوە وەزعـی سمـاقوڵی چـۆن بوە و ئەوەنـدە دەزانـین لـە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەیەمدا (کۆیـە-کۆیـسنجق) سـنجاقی ناوچـەکە بـوە کـە لقێـك لـە میرانـی سـۆران تێـدا جێنـشین بـوە و حـوکمڕانی کـردوە وەك دواتـر باسی دەکەین.

ڕۆژی (٢٠٠٩/٩/٤) چوم بۆ سماقوڵی و لە پێشدا چوم بـۆ سمـاقوڵی سەروچـاوە کە بەم ناوەوە نـاونراوە چونکە ئـاوێکی زۆری لێ هەڵدەقوڵێ و بـاغێکی یـەکجار زۆری هەیـە. لـە پـێش گونـد قـەلاّتێك هـەبوە بـەلاّم خـەڵکی گونـد زۆربـەیانی تێکـداوە. لـەوێ دیـدارم لەگـەڵ هەنـدێ لـە خەڵکەکـەی تۆمـارکرد بـە تایبـەتی بەتەمەنترینیان حاجی صابر قـادر عبـدالرحمن لـەدایك بوی (١٩١٨) ئـەوەش لـە بـارەی گوندەکـەوە. بـەمنیان ووت لـەو شـاخە هـەرە بـەرزەی بـاکوری ڕۆژئـاوای گوند لای (کانی زێندین) خانوەکانی جەماعـەتی سمکـۆی شـکاك هـەیە کـاتێ لـە گـەلی هـاتبون بـۆ کوردسـتانی باشـور (لـە١٩٢٢) لـەوێ خانویـان بـۆ خۆیـان

ئاواكردبو لەگەڵ پەزەكانیان و یەك ساڵ لەوێ مانەوە ئەگەر چی پێویست بوو بـچم وێنــەی شــوێنەواری خانوەكانیــان بگــرم بــەڵام دوام خــست لەگــەڵ شوێنەوارەكانی هەوارگەی (بایز بەگ) و (متیكوكا) لە باكوری گوند بۆ كاتێكی دیكـە شـایانی باسـە بـە مێـژووی (١٩٨٧/١٠/٤) بـەڕێز مامۆسـتا (مەجیـد ئاسنگەر)ی خەڵكی كۆیە دوو لاپەڕە زانیاری لە بارەی ئەو دوو هەوارگەیە بۆ منی نوسیبو كە شوێنەواری لێ یە لەگەڵ ئیحتمالی هەبونی كورەی تواندنـەوەی ئاسن كـە هەنـدێ لـە خـەڵكی كۆیـە هاوینـان دەچـونە ئـەم دوو هەوارگەیـە. لـە سماقوڵی سەروچاوە هاتم بۆ سماقوڵی گرتك پاش تەواوبونی نوێژی جومعـە لـە مزگەوت قسەم بۆ خەڵكەكە كرد لـە بارەی گرنگـی شـوێنەوار و پاراستنیان مام صابر رەسول شوێنەواری (گردی باوەجان) لەتەنیشتی باشوری ڕێگای گشتی و شـوێنەواری (گـردی قـەڵای پاشـا)ی پێـشاندام ئەمـەی دوایـی شـوێنەوارێكی گـەورە و گـرنگ و كـۆنی بـەر لـە ئیـسلام بـوە و خەڵكەكـەی كردویانــە ڕەز و بەردەكاكانی خـانوو شـورەیان بردوە بـۆ خـانو دروسـتكردن. (گـردی كێلـێ) لـە باشوری ڕۆژهەڵاتی گوند شـوێنەوارێكی بەنرخ بوە بەڵام تێك دراوە و كراوەتـە ڕەز. زانیـاریم لـە بـارەی هـەردوو سمـاقوڵی یـەوە تۆمـاركردوە لـە سـەر شـریتی كاسێت و ڤیدیۆ.

كاتێ گەیشتمە سماقوڵی گەلی (وێنە١) و (وێنە٢)

لە بەڕێز كاك زاهـر عوسمـان محەمـەد ئـەمین ئەنجومـەنی دێ یەكەم پرسـی ئایا شـوێنەواری قـەڵات وشـورە و بناغـەی خـانوی كـۆن لێـرە نیـە؟ ووتـی: بـەڵێ زۆر هەیە و لەنزیك ماڵی خۆی شورەی كۆنی پیشاندام.

(وێنە٣)

ئیتر بەو ڕۆژە و ڕۆژی ٣٠ ئەیلول توانیم مەسحی شورە و برج و قەلاّت و ئەو شوێنەوارانی لەسەر زەوی ماوە لە خانوەکۆنەکان بکەم. هەستم دەکرد شوێنەواری شارێکی کۆن لە سماقولّی ببینم بەلاّو باوەڕم نەدەکرد شوێنەوارێکی بەو شێوەیە گەورە و بەرین بێت لەگەلّ ئەوەی خەلّکی گوند زۆر لە بناغەی خانوە کۆنەکانیان دەرهێناوە و شوێنەکەیان بۆ دەغلّ و دان و باخ و بێستان بەکاردەهێنن و کوێریان کردۆتەوە و لەسەر زەوی شوێنەواریان دیار نەماوە ئەگەر بناغەیان لەژێر زەوی مابێت ئەوا دەبێت بەهۆی هەلّکۆلّین و پشکنینی شوێنەواری (تنقیبات) ئاشکرا دەبێت و گومان نیە کە بە ئاسانی دەدۆزرێت ئەگەر کارێکی لەو جۆرە بکرێت لە باشوری ڕووبار شوێنەواری کۆمەلّێك خانوو دیارە.

شورە لەبەری باکوری ڕوبار لە سوچی ڕۆژهەلاّت دەستی پیّ کردوە و لە ڕوبار تێپەڕ بوە بۆ بەری باشور تا (گردە شینکە) بەدرێژی دەوری (١,٥تا٢کم)

**لەبەر ئەوەی گردەکە لەم دەستەوە زۆر لێژ و لوسە و سەختە پیّ ناچیّ شورە گەیشتبێتە سەرەکەی بەلّکە پیّ دەچیّ لای ئەخیر برج وەستابێت کە لەوێنەکەدا طاهر عوسمان لەلای وەستاوە　　　( وینە٤)**

بەلاّم لە قەراغی ڕۆژئاوای گردەکە لەوانەیە گەیشتبێتە قەراغە بەرزی سەرەکەی. (وینەی قەراغی بەردەکە)

پاشان شورەی لە نزیك سەری گردەکەوە بەرەو باکور پێچی کردۆتەو تا لە ئاوی (کرۆژ) وچەمی دۆلّی سماقولّی تێپەڕ بوە بۆ باکوری چەم و تا گەیشتۆتە بەشی ڕۆژئاوا

لــە شــورە، لــەوێ لقێکــی لێ جیــابوە بــەرەو ڕۆژئــاوا تــا ســەر کەنــدی سنوریگوندی(سێنان)و لـەوێش هەڵگـەڕاوە بـەرەو بنـاری شـاخ کە ئەو بەشـەم مەسح نـەکردوە. بەڕێز شـوێنەوارناس جـەمال جـەمیل لـە کـاتی نوسـینی ئـەم ووتارە بەمنی ووت شورە لە کەندەکەوە تێپەڕبوە بەرەو سێنان. شـورە بەبـەردی تاشـراوی مـام ناوەنـدی ئـاواکراو گـەچ تێـدا بەکارنـەهاتوە لەتـە کەرپـوچـی ســورکراویش لــە شــوێنەوارەکەدا دەردەکــەوێت بــەڵام بــەردەکانی بەشـێکی سەربەخۆی لەشوێنەوارەکە کەلە هەرچوار دەوری شـورە هـەبوە لەگـەڵ قـەڵاتێك کە لەم دووساڵەی دواییدا وێران کراوە لـە باشـوری چەم و لـە بەشـی ڕۆژهـەڵات بـە بـەردی گەورەیـە تـا بـەرد هەیـە ١٥٠ ×٩٠سـم وە بـە ئەسـتوری (٧٠سـم)ە. (وێنە٥)

.

ئەم بەشە لە باشوری چەم بەگردێکەوە هەڵگەڕاوە و بە شورەی کـاتی ئەشـکانی (فرثــي) (١٢٩ پ.ز = ٢٢٧پـا.ز) دەزانم بــەڵام بەشــەکانی دیکــە واتــە شــورەی سەرەکی بە کۆنتری دەزانم لە کاتی ئەشکانی و لە نێوان هێڵـی شورەی بـاکور و بناری شاخ شـوێنەوارێکی زۆری کـاتی ئەشـکانی هەیە بـەڵام شورەی ناوقـەدی شـاخی ئـاوەگرد یـێ کـاتی شـورە گەورەکەیـە و بـە بۆچـونم هـی کـاتی ئاشورین لەگەڵ شوێنەوارەکانی سەر لوتکەی ئاوەگردیش لەوانەشە هـی نیـوەی یەکـەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین بێت.

داواکارین لە حکومەتی هەرێم بە زوترین کات داوا لە یونسکۆ بکات سـەردانی شوێنەوارەکانی سمـاقولی بکـات و لێکۆڵینـەوەی زانستی لـەو بارەیـەوە ئـەنجام بدات.

لە مەسافەی دەوری هەر(٣٠) مەترێك لەشورەکە برجێك هەبوە و هەندێکیان لە هەندێکیان گەورەترن.
ئەستوری شورە لە(١,٥ تا ٣م)ە واتە هەمووی بەقەدەر یەك پان و ئەستور نەبوە.
شورەکان هەموی بەسەر یەکەوە ئەوەی تائێستا دیومە پترە لە(٦کم).
تائێستا بەشوێنی سێ دەرگا لەدەرگاکانی شورە دەزانین، دەرگای رۆژهەلأت لە خواروی گوند کە شوێنەکەی رێك بوە لەگەڵ جۆگە ئاوەی ئێستا لەخواروی یەکەمین برج بە (٥٩م) خەڵکەکە زانیویانە دەرگابوە و ساڵێك جۆگەیان بەناو دەرگاکە دا ڕاکێشاوە و دەرگلکە یان تێکداوە بەلأم ئێستا جێگاکەی دیارە چونکە هەندێ لەبەردە گەورەکانی ماوە .
(وێنە٦)

دەرگای باشور: پێش ئەوەی مرۆڤ بگاتە گردەشینکە بەلای باکوری رۆژهەلأتەوە شوێنی دەرگا باش دیارە و فراوانیی(٢م)ە و رێگا لەم دەرگایەوە بەرەو باشور چووە و هەڵگەڕاوە تاسەر شاخی باواجی و (قەلأی مومن) و شۆربۆتەوە بۆ دەشتی کۆیە. (وێنەی ٧)

بەرێزان تاهیر عوسمان و زاهیری برای وتیان ئێمە و پێشینانمان بە کەر و بار لەم ڕێگایەوە کە ناوی (ڕێگای دۆڵە مومن)ە بەدوو سەعات و نیو دەچوین بۆ کۆیە وا هزر دەکەم ئەم دەرگایە و پلەکان یان سەکۆ پلە دارەی تەنیشتی ڕۆژهەلأتەکەی باشتر لە کاتەك دا وەك کاتی ساسانی هاتبێتە تەعمیرکردن.

دەرگای رۆژئاوا دەکەوێتە بەری باکور لە نیزیك شوێنی تێکەڵاوبوونی ئاوی کرۆژ و ئاوی دۆڵی سماقوڵی. لەوانەیە دەرگای باکوریش هەبێت.
شوێنەواری دووپردیکۆنیش لەسەر روبار هەیە یەك دەکەوێتە نێوقەدی شورەی بەشی رۆژهەلات و خەڵکەکەی بە بلدۆزەر شوێنەواری تێکداوە و تەنیا چەند بەردێك ماوە و پارچە قیریان لەلای پردەکەیان دیوە کەنیشانەی ئەوەیە پردەکە بەقیر هاتووەتە سواغ کردن وەك چۆن دوو پرد لەپردەکانی (گەلی عەلی بەگ) بەر لەسەدەی چواردەیەم بەقیر سواخ کرابوون کەپردی خاروی خەلیفان بوە کەمێك لە خواروی پردی ئێستا دەمی گەلی و پردی دیکەی سەر روباری باڵەکیان بوە کەئیمرۆ شوێنەواری هەردوکیان نەمان بەلام وێنەی شوێنەکانیانم گرتوە.سەنحاریب لە قەناتی (باڤیان) قیری بەکارهێناوە.
پردی رۆژئاوا دەکەوێتە نزیك شوێنی تێکەلاوبوونی ئاوی کوروژ بەئاوی سەرەکی دۆڵی سماقوڵی.
لەنێو ئەم شوێنەوارە گەورەی سماقوڵی دا هەندێ قەلاتی تایبەتی هەن کە لەچواردەوریان شورەی تایبەتی خۆیان هەیە ویەکیان پێ ی دەڵێن قەلای (قەلای پاشا) لەبەری باکور کە قەلای خۆی (٩× ١٥م)
(وێنەی ٨ ) و (وێنەی ٩)

بێجگە لەبرجەکەی کەلەتەنیشتی رۆژهەلاتەکەیەتی. شورەی چوار دەورەکەی (٤٠×٢٢م)بەپانی(٢م).(وێنە).لە باشوری رۆژهەلاتی ئەمیش دیسان قەلاتێك لەنێو شورەی تایبەتی خۆیدا هەبوەو پارچەیەك لە بەردەکانی ئەستونە بەردێك لەوێ کەوتوە, تیرەی (٧٠سم)بە بەرزی (٥٠سم)لەناوەراستیدا چالکەیەك هەبو بۆ تێهەلکێش کردن لەگەڵ پارچەیەکی دیکە

(وێنەی ١٠)

خەڵك ئەم قەلایەیان تێك داوە و کشتوکاڵ لەو شوێنەدا دەکەن بەلام هەندێ شوەر دیارە لەگەڵ هەندێ دیوار و هەندێکیش دەبێت لەژێر زەویدا مابێت.

## هێڵی بەرگری کردنی باکور

بۆ قایم کردنی سماقوڵی و پاراستنی هێڵێکی بەرگری کردن لەشورەو برج دروست کراوە لە پەساری باشور لەشاخی ئاوەگرد و لەشاخی رۆژهەلاتی ئاوەگرد کەناسراوە (بەشاخی شوران). وێنەی شورە
شورەی ئاوەگرد(١٦٣م) درێژ و (٢م) بڵندە و (٢م) ئەستورە و دەرگای لە تەنیشتی شاخی رۆژئاوایە و لەلای کانی ئاوەی سەروی شورە شوێنەواری خانوی کۆن هەیە و لە ١٩٦٣ پێشمەرگەکان هەندێ خانو لەنێو ئەو خانوە کۆنانەدا ئاوایان کردوە (وینە ١١)

بێجگە لەو شوێنەوارانەی باسمان کرد سماقوڵی دوو مێژووی دیکەی هەیە یەکەم شەڕی (دۆڵی ئەصحابان)ە
(وینە١٢)

کەشەڕێکی سەخت ڕویداوە لەنێوان لەشکری ئیسلام (ئەصحابان) و خەڵکی سماقوڵی ودەوروبەری لەساڵی (١٦ك=٦٣٧ز) کاتێ لەشکری ئیسلام بەهەدینان و(تل الشهارجة) واتا شاری (حزة-عەزە)ی نزیکی هەولێری داگیر کرد لەگەڵ

حبتون (دێرێ) کە شاربوە لەنزیك شاخی (پیرمەم) یان سالی (۲۲ی کۆچی= ٦٤٢ن) کاتێ (عتبة بن الفرقد) هێزێکی زۆری لە موصلەوە هێنا بۆ داگیرکردنی هەرێمی شارەزور باسی ئەم شەڕە لەیادی خەلك ماوە پشت بەپشت وتا لە کۆیە و رانیە و پشدەر و سلێمانی باس دەکرێت.

(وێنە ١٣)

قەبری صەحابان لەنێو کەلەکە بەردەکاندایە و ریزیان لێ گیراوە بەلام قەبری کوژراوە کوردەکان لەژێر کۆمەلە بەردەکاندایە پێیان دەوترێت (سەلکە کافر) کاك تاهیر عوسمان لە هەموو خەلکی سماقولی شارەزاترە لەم بارەیە ووتی: مام عەلی حەبێ(عەلی ئەحمەد) سماقولی زۆر لە بەسەرهاتی کۆنی دەزانی کاتێك لە (١٩٦١) وەفات بو تەمەنی لە سەد سالێ زیاتر بوو زۆر جار باسی شەڕی دۆلی ئەصحابانی بۆ دەکردین دەی ووت: میری سماقولی کە شەڕی کرد ناوی (ئەزنەگرد) بو (کە نزیکە لە ناوی یەزدەگورد-یزدجرد) لە ناوەکانی کاتی ساسانی). مام عەلی دەیووت: ناوی (ئاوەگرد) لە ئەزنەگردەوە هاتوە چونکە لەوێ دادەنیش و ئەصحابەکان هەموویان کوژران تەنیا یەکێکیان بە برینداری گەیشتۆتە هەورازە نەفت واتا (بەردەبان) لەسەر ڕێگای دەربەندی گۆمەسپان و هەولێر و لەوێ مردوە کە ئێستا پەڕۆی سەوز لەسەر قەبری دانراوە .[٢]

خەلکی سماقولی دەلێن: هەر کەسێك هاتبایە ڕاستی گۆڕی کوژراوە کوردەکان بەردێکی فڕێدەدایە سەر قەبریان و لەکاتی فڕێدانیدا دەی ووت: (بە نەعلەت بێ شەیتان) زوربەی بەردەکان بچوك بون بەلام هەبوو گەورەبو کە بە مرۆڤێك بەرز نەدەکرا و هەموو جۆرە بەردێکیان فڕێ دەدایە سەر (سەلکە کافر)

و پتر لە پەنجا کۆمەڵە بەرد (سەلکە کافر) هەبوو لەبەر ئەوەی زوربەی زۆریان لەسەر ئەو هێڵە بون کە ساڵی ١٩٩٣-١٩٩٤) کرا بە ڕێگای گشتی ئۆتۆمبێل کەوتۆتە ژێر ڕێگا و ئەوانەی لە دەوروبەری هێڵەکەبون بەردەکانیان بە گەلاّبە دەهێنا بۆ ژێر ڕێگاکە و ئێستا برێکیان ماوە بە کەمێك بەردەوە وێنەیانم گرتوە (وینە١٤)

شەش حەوتێکیان پاشماوەیان دیارە لە تەنیشتی باشوری ڕێگا لە نێوان سەری زینو تا کەڵەکە بەردی (ئەصحابەی بەردی پشتیّ) کاتێك وێنەی یەکێکی دیکەم دەگرت کە (١٥م) درێژ بوو پانی نزیکەی (١٠م) و مقدارێك لە بەردەکان مابوو

(وێنە ١٥)

بەڕێز هاوار فەتاح ئیسماعیل سماقوڵی هات و وەستاو ووتی: ئەم گۆڕە لە هوویان گەورەتر بوو و کاتیّ ڕێگەیان دروست کرد پازدە گەلاّبە بەردیان لیّ برد بۆ ڕێگاکە و کۆمەڵە بەردەکە پێنج مەتر بەرز بوو.

ئەم نەریتەی فرێدانی بەرد و(رەجم) کردنی ئەو کوردانەی لە شەڕی صەحاباندا کوژراون و بەسەدان ساڵ هەبوە لەلای کودە ئیسلامەکانەوە و لە هەندیّ ناوچە پیّ دبێژن(گۆڕ جولەکە)

لەوانەشە لەژێر کۆمەڵە بەردێکدا پتر لە کوژراوێك هەبێت لە دۆڵی ئەصحابان.

ئەم دۆڵە دۆڵێکی زۆر قولّ نیە درێژی قەبرستانەکە (٢کم)ە لە زینوی ڕۆژهەلاّتی دێیەوە دەست پیّ دەکات بەرەو ڕۆژهەلاّت بەلاّم پان و بەرین نیە و یەکەم قەبر لە ڕۆژهەلاّتەوە لەژێر ڕێگا قەبری ئەصحابە ڕەشە لە نێو کەڵەکە بەردێك دایە و پەڕۆی سەوزی لەسەرە (وێنە ١٦)

ئەوەی قەبری ئەصحابەکان لەوێ بوە ئیتر خەڵك ئەو قەبرستانەیان بە پیرۆز زانیوە و مردوەکانی خۆیان لە دیهاتەکانی دیکەش دەهێناو لەوێ دەنێژران. بۆنمونە سوار ئاغای محەمەد ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی بلباس و ئیسماعیل ئاغای کوڕی و سوارەی و قادر ئاغای سوار ئاغا و شێخ مەحمودی گوندی کرۆژ.

خەڵك لە کۆیە و خۆشناوەتی و لە ناوچەی ڕانیەو هەولێر دەهاتن بۆ زیارەت کردنی قەبرستانەکە و شەو لەوێ دەمانەوە و مەولودیان دەخوێند. لە ڕۆژانی (١٣-١٥)تشرینی دووەمی ٢٠٠٩ پازدە کۆمە بەردم بەپارە دایە دروست کردن بە سەرپەرشتی تاهیر عوسمان کۆمەڵە بەردە نویێ یەکان لە پاستی کۆمەڵە بەردە کۆنەکان دانراوە و ئەوانەی کەوتونەتە ژێر ڕێگا واتا بەرامبەر شوێنە ئەسڵیەکان دانراوە وەك زیندوو کردنێکی(ڕەمزی) بەڵام کرێکارەکان بەردی مەیلەو گەورەیان هێناوە کە دەبێ هەندێ بەردی بچوك لەسەریان زیاد بکرێت بێ گومان دۆڵی ئەصحابان بوەتە داستانێکی مێژووی و پێویستە بایەخی پێ بدرێت و بپارێزرێت. (وێنە ١٧)

مێژووی دیکەی سماقوڵی داستانی (شەڕی ئاوەگرد)ە ( وینە١٨)

لە ساڵی ١٧٥١ عوسمان پاشای محەمەد پاشای کۆیە خۆی قایم کردوە لەم شاخە سەختەی پشت سماقوڵی کە بەرزی دەوری(١٤٠٠م)ە و لەوانەیە بەرزترین لوتکە بێت لە زنجیرە شاخی سەفین ئەگەر لوتکەی کانی شیلان لەو بەرزتر نەبێت. والی دەوڵەتی عوسمانی لەبەغدا سلێمان پاشا(ابو لیلة) هێزێکی زۆری هێناوەتە سەری لە ڕێگەی دەربەندی گۆمەسپانەوە و چواردەوری

ئاوەگردی ئابلوقە داوە و رێگای ئاوی لەسەر عوسمان پاشا و جەنگاوەرەکانی بڕیوە. لەوانەیە ئاوی کانی ژێر لوتکەی ئاوەگرد بەشیان نەکردبێت و هەر وەك ئێستا کز بوبێت رۆژی (٢-١٠-٢٠٠٩)کەچومە سەر ئاوەگرد لەگەڵ زاهر عوسمان و دۆستێکی کوڕم ئاوی زۆر کزبو وسێزدە چاڵە ئاوی سەر لوتکەی ئاوەگردیش ووشك بون
(وینە ١٩)

لەبەرئەوە پاش شەڕێکی سەختی وەك شەڕی (قەڵای دمدم) عوسمان پاشا ناچاربو لە ڕۆژی پێنج شەممە (٢٦ رەمەزانی ١١٦٤کۆچی - ١٨ی ئابی ١٧٥١) تەسلیم ببێ وسلێمان پاشا کە جەللادێکی زەمان بوە سەری عوسمان پاشاو هەردوبرای ئیبراهیم بەگ و سلێمان بەگ لەگەڵ سەری حەسەن بەگی کوڕی بڕیوەو ناردوە بۆ سوڵتان لەئەستەمبوڵ پاش ئەم سەرکەوتنە سلێمان پاشا ئابڵوقەی (قوچ پاشا)ی برای عوسمان پاشای داوە لە قەڵای هەولێر کە دەوڵەتی عوسمانی لەبەر ئازایەتی ئەو لە شەڕەکانی نێوان دەوڵەت و نادر شادا خەڵاتی کرد و کردی بە حاکمی هەولێر پاش نۆ ڕۆژ لە شەڕ سلێمان پاشا بەسەر قوچ پاشا زاڵ بوو سەری ئەویشی بڕی و ناردی بۆ ئەستەمبوڵ. هۆی ئەم شەڕە وەك شێخ رەسولی کەرکوکی لە (دوحةالوزراء) ل ١١٦-١١٧ دا نوسیویەتی عوسمان پاشا و سەلیم پاشای بابان جیابونیان لە دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند و داوای سەربەخۆییان دەکرد هەروەها نوسیویەتی عوسمان پاشاو جەنگاوەرەکانی لەشەڕدا هێندە ئازایەتییان پێشاندا کەلەوە زیاتر نابێت. باسی داستانی شەڕی ئاوەگرد لەچەند سەرچاوەیەکی دیکەشدا هاتوەو شاعیری بەغدایی (عبدالرحمن السویدی)شیعرێك بەم شەڕەوە گوتوە. لەووتارێکی تایبەتدا باسی ئەم

داستانەی دەنوسین. بەم جۆرە سماقوڵی مێژوویەکی گەورەی هەیە و دەبێ ئەم مێژووە زیندو بکرێت و بپارێزرێت.شایانی باسە لوتکەی ئاوەگرد باریك و تەنگە درێژی دەوری (١٣٠م) بە پانی (٣٠م) قەلات لەسەر لوتکەی هەبوە و شوێنەکەیم دەستنیشان کردوە و شورەش لە بەشی باشور هەبوە. سلێمان پاشا قەلاتەکەی وێران کردوە. لە کاتی شەڕی نێوان پارتی و یەکێتی چەکدارانی یەکێتی شورەکەیان تێکداوە و بەردەکانی لەگەڵ پاشماوەی بەردی قەلات کردویانە بە سەنگەر و هۆدەیەك.

(وینە ٢٠)

چاڵە ئاوەکان کە لەبەرد هەڵکەنراون هەموویانم پێوا و وێنەیانم گرت و بەشەوی تاریك و سەربەرەو ژێر گەیشتینە بنی شاخەکە و ڕێگاکەش زۆر ناخۆش بوو.

(وێنە ٢١)

بەمێژووی (٧-٩-٢٠٠٩) ڕاپۆرتێکم نوسی لەبارەی شوێنەوارەکانی سماقوڵی بۆ بەڕێز دیوانی ئەنجومەنی وەزیران د.نوری عوسمان شنگالی نوسیومە وەزارەتی سەرچاوە ئاویەکان نیازیەتی بەنداوێك لەسماقوڵی دروست بکات بە ناوی بەنداوی جەلی یەوە واتا دێ جەلی لە خواروی گەلی سماقوڵی کە پێشی دەوترێت (حەمام جەلی) چونکە ئاوی کبریتی لێ یە. بەنداوەکە شوێنەوارەکان و زەوی و زار و باخەکانی سماقوڵی لەژێری نقوم دەبێت و دانەشم داوەتە وەزارەت و بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواران ڕۆژی (٣٠-٩-٢٠٠٩) بەڕێوەبەری گشتی بەنداوەکان بەڕێز ئەکرەم ڕەسول لەگەڵ هەشت کەس و بەڕێوەبەری گشتی شوێنەواران بەڕێز ئەبوبەکر عوسمان زەینەدین ناسراو

بەناوی پێشمەرگایەتی (مەلائاوات)لەگەڵ چوار شوێنەوارناس هاتن بۆ سماقوڵی و خەڵکی گوندیش کۆبون و هەمومان کۆبونەوەیەکمان کرد لەبارەی بەنداوو شوێنەوارەکانەوە. (وێنە ٢٢)

درێژی بەنداو(١٩٠٠م)ە و (٨٠٠) دۆنم زەوی وباخ نقوم دەکات ودێ ی سماقوڵیش لەنێو دەچێت.

بەمێژووی ٤-١٠-٢٠٠٩ راپۆرتێکی دیکەم نوسی بۆ بەڕێز سەرۆکی دیوانی ئەنجومەنی وەزیران وپاش ئەمە چەند فەرمانبەرێکی شوێنەواران هاتون و بەچەند رۆژێك مەسحی شوێنەوارەکانیان کردوە و لەسەر نەخشە دەستنیشانیان کردوە لەگەڵ بەڕێزان رووخۆش نەجم و ئارام عەبدوڵلاّ لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی بەنداوەکان. (وێنە ٢٣)

وەك لە راپۆرتی دووەممدا رەئیی خۆم نوسیوە نابێ ئەم شوێنەوارە زۆرەو ئەو مێژووە کۆنە لەنێو بچن بەهۆی بەنداوێکی بچوکەوە .ئەم شوێنوارانە لەگەڵ هەردوو داستانەی دۆڵی ئەصحابان و شاخی ئاوەگرد هەمو ئەو مێژووە گەورەی سماقوڵی پێك دێنن و لەیەکتر جیا ناکرێن.

لە کۆتاییدا زۆر سوپاسم هەیەبۆ ئەو کەسانەی یارمەتی منیان دا لە مەسح کردنی شوێنەوارەکان لە خەڵکی سماقوڵی بەتایبەتی بەڕێزان زاهر عوسمان و تاهری برای و ئەنوەری برایان و مام صابر ئەحمەد و دڵشاد مەحمود و ئەیوب ئەبوبەکر و رەشید ئەبوبەکر و سەید ئارام فەرهاد.

لە رۆژئاوای دێ باداوان لە دۆڵی خەلەکان قەبری (پۆلاد) و خوشکی هەیە لە کوژراوەکانی شەڕی ئەصحابان و خەڵکی کۆمەڵە بەردێکیان لەسەر داناوە و لە

باداوانیش قەبرێك هەیە و دەڵێن هی ئەصحابەیەکە لێرە کوژراوە. شەڕێکی زۆر لە هەرێمی شارەزور (ناوچەی سلێمانی) ڕویداوە و لە زۆر شوێن خەڵك دەڵێن قەبری صەحابان هەیە کە بەدرێژی ئەمەم نوسیوە لە کتێبە دەستنوسەکەم (قەر و گوڵەزەر)

تێبینی: ووتارێکی کورتم بلأوکرد لە بارەی سماقوڵی لە خەبات ژمارە(٣٣٣٤) ڕۆژی ٢٠٠٩/١١/٢٤.

پەراوێز:

١- مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی هەوڵی داوە ناوی (نیلیخاص)لە سەرچاوەیەکی دیکە دا ببینیّ و بزانیّ چ عەشیرەتێك بوە بەلأم نەیدیوە تەنیا موکریانی لە (إمارة سوران) هەمان ناوی هێناوە و ئەویش لە شەرەفنامەی وەرگرتوە تەماشا شەرەف نامە وەرگێڕی عەرەبی مەلا جەمیل ل ٤٥٧ چاپی ٢٠٠١.

٢- بەپیّ گێڕانەوەی هەندێك لە خەڵکی سماقوڵی صەحابەکان هەمویان کوژراون تەنیا خالد بن الولید و شێخ عبدالله کە گۆڕی ئەمەی دوایی لە گوندی (سید عبدالله) لە ناحیەی حەمدانیە و لە نزیك زیّ گەورە لە ڕۆژئاوایەوە قوتاربون. بەلأم خالد بن الولید نەهاتوەتە کوردستانی باشور بەڵکو لە ولأتی شامەوە تا (قەلأی هەتاخ) هاتوە لەباشوری شاری (لجیّ)و بەدەوری (٩٥کم) لەرۆژهەلأتی شاری دیاربەکر وەك لە(فتوح الشام)ی واقدی دا ب٢ ل١٦٧ دا هاتووە.رۆژی (٢١-٨-١٩٧٧)وێنەی قەلأی هەتاخم گرتوە.

خەڵکی سماقوڵی ناوی ئەو ئەصحابانەی لەویّ کوژراون نازانن بەڵکو خۆیان چەند ناوێکیان لیّ ناون وەك (ئەصحابە ڕەش و ئەصحابە مغدید اسود (ئەصحابەی بەردی پشتیّ) و هەروەها ئەصحابەی گۆچانان و و ئەصحابە تاهر) کەڵەکە بەردی ئەصحابەی گۆچانان (کاکی گۆچانان)لە تەنیشتی باکوری ڕێگایە لە خواروی زینوەکە. دەڵێن ئەم ئەصحابەیە هەرزەکار و شوان بوە کاتیّ لەگەڵ ئەصحابان لە عەرەبستانەوە هاتوە بۆ شەڕ شمشێری پیّ نەبوە تەنیا گۆچانێکی لە دەستدابوە. لەسەر گۆڕەکەی هەموو کاتیّ چەند گۆچانێك (گۆپاڵ) هەیە،

ئەگەر ئاژەڵ توشی نەخۆشی ببێت شوان دێت و گۆچانێك لەسەر قەبرەکەی دەبات و نەخۆشی مەڕەکە بەو گۆچانە دەڕوات و پاش نەمانی نەخۆشیەکە گۆچانەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ سەر قەبرەکە.

لە ل ۱۳۰ لە کتێبی کوردستان و ئایینی ئیسلام کە مەلا سەلیمی حەوێزی لە (۱۹۷۰) چاپی کردوە بە ناوی خۆیەوە کە دانراوی ئەو نیە نوسراوە (۳۰۰۰) کەس لە کوردەکان و (۱۵۰) کەس لە ئەصحابەکان لە دۆڵی ئەصحابان کوژران.

طاهر ئەحمەد حەوێزی لە مێژووی کۆیە ب ۲ ل ٤٠ شتێکی لەم کتێبە وەرگرتوە و نوسیویەتی جار جار بە خەڵکی سماقوڵی دەڵێن (ئەصحابە کوژ).

بەیتی تایبەتی لە بارەی ئەم شەڕە لنێو خەڵکدا هەبوە و نەنوسراوە بزربوە. لە ڕۆژی (١٩٨٢/٢/٦) کاتێ بیرەوەریەکانی خوالێخۆش بوو سۆفی صالح ئەحمەد ئەبوبەکر ڕانیەییم تۆمار کرد لەسەر شریتی کاسێت زۆر کەم لە بەیتەکەی بیر مابوو تۆمارم کرد ووتی: بۆیە دەڵێن دۆڵی ئەصحابان چونکە زۆر ئەصحابە لەوێ کوژراون.

# بەڵگەنامەی بڵاونەکراوە

ئامادەکردنی د. محمد عبدالله کاکەسوور

ئەم بەڵگەنامەیە تایبەتە بە شاعیری ناوداری عێراقی بڵند حیدەری کە هەندێك زانیاری و نمرەکانی ساڵی خوێندنی ١٩٣٧-١٩٣٨ی لە قوتابخانەیەکی هەولێر تیادایە.

ناو: بڵند

ناو و نازناوی باوکی: عەرەب

پیشەی باوك: ئەفسەر سەرۆك لە سوپادا

سەرپەرشتیکەری: باوکی

شوێنی لە دایك بوونی قوتابی: بەغداد

رەگەزنامەی: کورد

سەر بە عێراق

ئاین و ئاینزای: موسڵمان

ساڵی لە دایك بوون : ١٩٢٧

دوا قوتابخانە کە لێی بووە کەرکووکی مەرکەزی

مێژووی وەرگیرانی لەو قوتابخانەیە ١٩٣٨/١/٨

ئەو پۆلەی لێی وەرگیراوە : پێنجەم

هۆی دابڕانی لە قوتابخانە : چووە بۆ قوتابخانەی مەرکەزی لە کەرکووك

نیشانە جیاکەرەوەکانی : پاشماوەی برین بەسەر ڕوومەتەکانیەوەیە

بارودۆخی تەندروستی قوتابی باشە

بارودۆخی قوتابی لە قوتابخانەدا پێشکەوتووە

# وێنەی مێژوویی



أمیر یوسف عیزالدین
وەلی عەهد



سوڵتان محمد رشاد



جنرال انور پاشا
وەزیری حەربیە



فریق محمود شوکت پاشا
رئیس ارکانی حربی دەوڵەتی عوسمانی

